# بابەتی قۆناغ : پرسیار و وەڵام لە سەر ناسینی ( خير القرون ).

## پرسیار خير القرون کێن ؟

**لەوەڵامدا دەڵێین** : بزانن ڕەحمەتی الله برژێ بەسەرتان:

خير القرون : مەبەست لێی سێ سەدەی ( صەحابە و تابعي و تابعي تابعين ) دەگرێتەوە کەلەگەڵ وەحی ( قورئان و سوننەت ) ژیاون کە بە چەنەها شێوە باس کراون لە قورئان و سوننەت ، الله تعالى ئەفەرموویت : { فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوا ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ } [ البقرة ١٣٧ ] الله جل جلاله ئەفەرموویت : ئەگەر ئیمانیان هێنا بە وێنەی ئەوەی ئێوە ئیمانتان هێناوە(واتە وەك صحابە)ئەوە ئەوانە لەسەر حەقن و ڕێنمونی کراون وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوانە تەنها لە جیاوازی و ناکۆکین لەگەڵت الله بەسیانە کە بیسەر و زانایە .

یان لەئایەتێکی تردا { وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ } [ التوبة ١٠٠ ] الله جل جلاله ئەفەرموویت : وە ئەوانەی پێشکەوتوون ( یەکەمینن ) ( لە ئیمان هێنان و جەنگان

لە پێناو الله ) لە کۆچبەران و پشتیوانان وە ئەوانەی شوێنیان کەوتوون لە چاکەدا الله لێیان ڕازی بووە و ئەوانیش بە پاداشتی الله ڕازی بوون وە باخاتێکی بۆ ئامادە کردوون کە ڕووباری بەژێردا ئەڕوات بە هەمیشەیی تێیدا ئەمێننەوە وە ئەوەش بردنەوەی گەورەیە.

## شاهێدی دان بەچاکی و باشی خیر القرون لەلایەن پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویێت : چاکترینی ئەم ئوممەتە سەدەی منە (هاوەڵانم) ، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان ، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان ، إمام عمران (رحمە اللە) دەفەرموویێت : نازانم دوای قەڕنی هاوەڵان دوو قەڕنی گووت یاخود سێ.[1]

* لەفەرموودەیەکی تر پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەفەرمووێت : باشترینتان ئەم سەدەی منە پاشان ئەوەی دوای ئەو کە دێت پاشان ئەوەی دوای ئەو کە دێت.[2]

بڕوانە باسی چاکی ئەو سێ سەدەی کردووە بە ڕەهایی واتە لە هەموو شتێکدا چاکترینن لە ئیمان هێنان لە زانست و تەقوا و هەموو شتێکی تر.

---

[1] صحيح البخاري (٣٦٥٠).

[2] البخاري٢٦٥١ و مسلم ٢٥٣٥

* **ئیبن عومەر** لە تەفسیری ئایەتی{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّه وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ } ئەی بڕواداران ترسی اللەتان هەبێت و لەگەڵ ڕاستگۆیان بن.

فەرمووی : لەگەڵ موحەممەد و هاوەڵانی.[١]

* (**مقاتل بن سليمان**) دەربارەی ئەم ئایەتە (وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا)(الفرقان: ٧٤) دەڵێ : وامان لێ بکەیت شوێنکەوتەی سەلەفی صالحمان بین ، بۆ ئەوەی ئەوانەی دوای خۆشمان بین بە شوێنکەوتەی ئێمە.[٢]

ئەمە چەن ئایەت و فەرموودە و ئەسەرێك بوو تا خوێنەر لە فەزڵ و پێگەی ووشەی ( خيرالقرون ) تێبگات.

## پرسیار هاوەڵان کێن بەکێ دەڵێن هاوەڵ ؟

لەوەڵامدا دەڵێین : بزانن ڕەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتان.

صـەحابە (هاوەڵ) بەو کەسە دەگووترێ کەوا پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـی بینیوە ، ئینجا ئیمانی پێی هێناوە:

هەریەك بینیبێ و بڕوای پێنەهێنابێ پێی ناڵێن سەحابە.

[١] السنة حرب الكرماني ٢٥١

[٢] موسوعة التفسير المأثور: مـ : ١٦ صـ : ٢١٠.

لەو پێناسەیە حاڵەتی تایبەت هەیە ئەویش : کەسی نابینا بەچاوی سەر نەیبینیوە بەڵام بڕوای پێ هێناوە ، وەکو ( إبن أم مكتوم )ـی نابینا.

**پرسیار التابعين کێن ؟ بەکێ دەڵێن تابعي ؟**

لەوەڵامدا دەڵێین : بزانن ڕەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتان.

★ تابیعین : بەوانە دەگوترێ پێغەمبەریان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەبینیوە تەنها هاوەڵانیان بینیوە.

**چەن نموویەك لە تابعین لە گەورە و بچووك:**

**تابعی گەورە وەکو:**

سعيد بن المسيب ، محمد بن سيرين ، حسن البصري.

**تابعی بچووک وەکو:**

قتادة بن دعامة ، سليمان بن مهران (الأعمش) ، إبن شهاب الزهري.

★ تابعي مُخَضْرَم : بەوانە دەگووترێت کەوا گەیشتوون بەسەردەمی جاهیلیەت ، وە بڕوایان هێناوە بەڵام پێغەمبەریان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەبینیووە.

تابعي مُخَضْرَم وەكو : أبو عمرو الشّيباني، وسُويد بن غَفَلة الكِنديّ ، وعمرو بن ميمون الأوديّ ، وعبدُ خير بن يزيد الخيواني ، وأبو عثمان النّهدي ، وعبد الرّحمن بن ملّ ، وأبو الحلال العتكي ربيعة بن زُرار .

## پرسیار مەبەست چیە لە اتباع التابعين ؟

لەوەڵامدا دەڵێین : بزانن ڕەحمەتی الله برژێ بەسەرتان.

★ ئەوانەن كەوا هاوەڵانیان نەبینیوە ، تەنها تابیعینیان بینیوە.

## چەن نموونەیەك لێیان :

### گەورە ئەتباعی تابعین كێن ؟

پێشەوا ئەوزاعی شامی لە ساڵی ٨٨ لەدایک بووە.

مالیكی كوڕی ئەنەس لە ساڵی ٩٣ لەدایك بووە.

سوفیانی كوڕی سەعیدی سەوری لە ساڵی ٩٧ لەدایک بووە.

ئەمانە پێیان دەڵێن گەورە ئەتباعی تابعین.

### (صغاري اتباع التابعين) وەكو:

سفيان بن عيينة.

يحيى بن سعيد القطان.

عبدالرحمن بن مهدي.

## پرسیار چوار خەلیفەکە کێن ؟

لەوەڵامدا بزانن ڕەحمەتی الله برژێ بەسەرتان .

**یەکەمیان** : ئەبو بەکر [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه] :

★ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عوسمان (کوڕی ئەبی قحافەیە).

★لە ساڵی ٥١ی پێش کۆچی لەدایك بووە.

★یەکەم موسوڵمانی پیاو بووە.

★ یەکەم خەلیفەی ئوممەت بووە.

★هاوڕێی ساتی کۆچ بووە لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

★خەلافەتی ٢ساڵ و ٣مانگ ونیو بوو.

★ لە ساڵی ١٣ھ وەفاتی کردووە.

**دووەمیان** : عمر بن الخطاب [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه]:

★ناوی عومەڕی کوڕی خەتتابی کوڕی نەفیلی قوڕەیشی عەدەویە. ★دووەم خەلیفەی ئوومەت بووە.

★ لە جاهیلیەت لە پاڵەوانان و گەورەی قوڕەیش بوو.

*ئەبو لؤلؤەی مەجوسی شەهیدی کرد.

★ وەفاتی کرد لە کۆتای ساڵی ٢٣ك، تەمەنی ٦٣ ساڵ بوو .

**سێیەمیان** : عثمان بن عفان [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه] :

★ ناوی عوسمانی کوڕی عەففانی کوڕی ابی العاص کوڕی ئوومەویە.

★ قوڕەیشی بووە.

★ سێیەم خەلیفەی ئیماندااران بووە.

★ لە ٤٧ پێش کۆچی لە مەککە لەدایك بووە.

★ بە **(ذي النورين)** ناسرابوو چونکە دوو کچی پێغەمبەری صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خواستبوو ئەوانیش (رقية ئینجا أم كلثوم).

★ وەفاتی کرد لەکۆتای ساڵی ٣٥ك کە تەمەنی ٨٢ ساڵ بوو .

**چوارەمیان** : على بن أبي طالب [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه] :

★ناوی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی کوڕی عەبدوالموتتەڵیبی کوڕی هاشمی قوڕەیشیە.

★ ئامۆزای پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و زاوای بووە.

★چوارەم خەلیفەی موسوڵمانان بووە.

★ لە ساڵی ٢٣ پێش کۆچی لەدایك بووە.

★لەلاین عبدالرحمن بن ملجم شەهید کرا. وەفاتی کرد لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی ٤٠کۆچی تەمەنی نزیکەی ٦٠ ساڵ دەبوو .

## پرسیار ئەهلی ( شوری ) ڕاوێژپێکردن کێن ؟

لەوەڵامدا : بزانە ڕەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتان .

ئەهلی ڕاوێژ پێکردن بریتیی بوو لەچەند گەورە هاوەڵێکی بەڕێز و خاوەن فەزڵ کە هەموویان بۆ خیلافەت دەبوون ، هەندێ دەڵێن پێنجن و هەندێکیش دەڵێن شەش ئەوانیش : هەندێ ئیمامی عوسمان دادەنێن وە هەندێکیش ئیمامی عەلی ، ئیمامی ئەحمەد لەدوای سێ خەلیفەکە ئینجا ئیمامی عەلی دێنێ لە ڕیزی ئەهلی ڕاوێژ پێکردن.

**یەکەمیان:** الزبیر بن العوام [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه] :

★ناوی: باوکی عەبدوڵڵای زوبەیری کوڕی عەووامی ئەسەدی قورەیشیە.

★لەساڵی ٢٨ پێش کۆچی لەدایك بووە.

★ کاتێك موسوڵمان بوە تەمەنی ١٢ ساڵان بووە.

★ لە جەنگی (الجمل) شەهید دەکرێتن.

★لە ساڵی ٣٦ك وەفاتی کردووە، کە تەمەنی ٦٤ ساڵ بوو .

**دووەمیان** : عبدالرحمن بن عوف [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه] :

★ناوی: ابو محمدی عبدالرحمن کوڕی عوفی کوڕی حارثی قوڕەیشیه.

★ لە گەورە هاوەڵان بووه.

★بەژداری هەموو جەنگەکانی کردووە.

★یەکێك بووە لە هەشتەم کەسی سەرەتای ئیسلام.

★لەساڵی ٣٢ك وەفاتی کردووە تەمەنی ٧٥ ساڵ بووە.

**سێیەمیان** : سعد بن أبي وقاص القرشي [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه]:

★ناوی : سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی مالیکی کوڕی ئەهیبی کوڕی عبد مەنافی قوڕەیشیه.

★لەساڵی ٢٣ پێش کۆچی لەدایك بووە.

★موسڵمان بووە تەمەنی ١٩ ساڵ بووە هەندێ دەڵێن ١٧ ساڵ بووە.

★فارسی ئیسلامە و پاڵەوانی ئوممەت بووە ، یەکەم تیر لەئیسلام ئەو بەکاری هێناوە ، بەشداری هەموو جەنگەکان بووە.

★پێش وەفاتی چاوەکانی لەدەست داوە.

★لەساڵی ٥٥ کۆچی وەفاتی کردووە تەمەنی ٨٤ ساڵ بوو.

**چوارەمیان:** طلحة بن عبيدالله [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه]:

★ناوی: ابو محمدی طلحەی کوڕی عبيدالله کوڕی عثمانی تمیمی قورەیشی بووە.

★ یەکێك بوو لەو ١٢ هاوەڵەی کە زوو موسوڵمان بوو.

★ ساڵی ٢٨ پێش کۆچی لەدایك بووە.

★ لە جەنگی (الجمل) شەهید دەکرێ .

★ لە ساڵی ٣٦ك وەفاتی کردووە، کە تەمەنی ٦٤ ساڵ بوو.

**پرسیار ئەو هاوەڵانە کێن پێغەمبەر فەرموویەتی قورئانیان لێ وەربگرن ؟**

لەوەڵامدا بزانن ڕەحمەتی الله برژێ بەسەرتان.

رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: (**خُذُوا القرآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ ، مِنِ ابنِ مسعودٍ وَأُبَيِّ بنِ كعبٍ ، ومعاذِ بنِ جبلٍ ، وسالمٍ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ**) .

**یەکەمیان :** عبدالله بن مسعود [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه]:

یەکێکە لە چوار قورئان خوێنەکەی ئوممەت ، لە زاناکانی نێو سەحابەیە ، یەکێك بوو لەخزمەتکار و نزیکەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ساڵانێکی زۆر لەگەڵی بوو ، سەحابەیەکی پڕ عیلم بوو ، لە ساڵی ٣٢ك وەفاتی کردووە.

**دووەمیان** : سالم مولى أبي حذيفة [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه]:

لە ساڵی ١٢ھ وەفاتی کردووە.

**سێیەمیان** : أبيَّ بن كعب [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه]:

ناوی : ئووبەیەی کوڕی کەعبی کوڕی قەیسی کوڕی عوبەیدەی کوڕی زەیدە، یەکێك بووە لە قورڕائەکانی ئوممەت کە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمانی کردووە قورئانی لێوەربگرین ، لەساڵی ١٩ك وەفاتی کردووە ، وەدەشڵێن ٢٢ك وەفاتی کردووە .

**چوارەمیان** : معاذ بن الجبل [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه]:

لە ساڵی ١٨ك وەفاتی کردووە و تەمەنی ٣٣ ساڵ بووە .

**پرسیار مەبەست چیە لە ( وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ ) ؟**

لەوەڵامدا بزانە ڕەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتان.

مەبەست لەو هاوەڵانەن کەوا لەسەرەتای ئیسلام ئیمانیان هێنا وەکو دایکی ئیماندارا‌ن خەدیجە و پێشەوا ئەبوبەکر و پێشەوا بیلال و پیشەوا ابن مسعود و

پێشەوا علی و کۆمەڵێکی تر هەندێك دەڵێن ژمارەیان پەنجا کەس دەبێ و هەندێ دەڵێن زیاتر.

## پرسیار کام هاوەڵ وای کرد ئەبو بەکر قورئان کۆبکاتەوە ؟

لەوەڵامدا بزانە ڕەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتان.

ئەو هاوەڵە پێشەوای بەڕێز و خەلیفەی ئیماندارارن (عومەری کوڕی خەتتاب) بوو ، ئەو هاوەڵەی داوایان لێی کرد (زەیدی کوڕی ثابت) بوو.

★ زید بن الثابت الفرضی [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه]:

لەساڵی ٤٥ك وەفاتی کردووە. (ابو خارجەی زەیدی کوڕی ثابتی کوڕی ضەحاکی ئەنصاری خەسرەجیە ، نوسەری وەحی بووە ، کە باوکی دەکوژرێ ئەو تەمەنی ٦ ساڵان بووە ، کاتێک کۆچ دەکات لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّی اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تەمەنی ١١ ساڵان بووە ، کاتێك وەفاتی کرد ابو هريرة [رَضِيَ اللَّهُ عَنْه] فەرمووی : ئەمڕۆ حەبری ئوممەت وەفاتی کرد ، بەڵکو الله تعالی ابن عباس بکاتە شوێن گرەوەی.

## پرسیار پێویستە شوێن چ مەنهەجێک بکەوین ؟

لەوەڵامدا بزانە ڕەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتان.

پێویستە شوێنکەوتەی ئەوانە بین کە الله و پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لێیان ڕازی بوو وە وەسفی کردن و الله تعالاش لە قورئاندا وەسفی کردوونە و لێیان ڕازی بووە بەهەشتی بۆ ئامادەکردوون ، الله عز وجل فەرموویەتی : {وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ} [ التوبة : ١٠٠ ] واتە : وە پێشەنگە یەکەمەکان لە کۆچەران و پشتیوانان ئەوانەش زۆر بە چاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون الله لێیان ڕازییە ئەوانیش لە الله ڕازین ، بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا تێیدا دەمێننەوە بێ بڕانەوە ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە.

مەنهەجی سەلەف واتا خير القرون شوێنکەوتنی حەرف بە حەرفی عەقیدە و ئینجا فیقهـ و ئەخلاق و ئەدەب و زوهد و وەڕەعیان چەند لەوان نزیک بین لە رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نزیکترین وە چەند لە رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نزيك بين لە سەر ڕاسترین ڕێگەین کە صراط المستقیمە و الله تعالى لێی ڕازیە.

## هۆکاری شوێن کەوتنی ئەوان بۆ چیە ؟

وەڵام : بۆئەوەی سەرلێشێواو نەبین و دووربین لە بیدعە و داهێنراوەکان و شلۆەوی و ڕاوبۆچوونی ئەم و ئەو و ڕای لاوازی خۆمان شوێنکەوتەی خیر القرون بین بە مەنهەجی ئەوان دینداری بکەین رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت:

(لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أُمَّتِي مَا أَتى عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ: تَفَرَّقَ بَنُو إِسْرَائِيلَ عَلَى اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً وَسَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ، تَزِيدُ عَلَيْهِمْ، كُلُّهَا فِي النَّارِ إِلَّا مِلَّةً وَاحِدَةً، فَقَالُوا: مَنْ هَذِهِ الْمِلَّةُ الْوَاحِدَةُ؟ قَالَ: مَا أَنَا عَلَيْهَا وَأَصْحَابِي).

بۆئەوەی لە کۆمەڵی موسڵمانان دانەبڕێین ، پێویستە شوێن ئەوان بکەوین ، وە بەو جۆرە دین جێبەجێ کەین کە فەرمووی : ئەوەی من و هاوەڵانم لەسەرین.



## فەزڵ و پێگەی هاوەڵان و شوێنکەوتنیان.

پێشەوا **ئەوزاعی** دەفەرمووێ : هەر کەسێك کە شتێکی لە رسول الله ـەوە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێدەگات وا نابینم بێجگە لە شوێنکەوتن هیچی دیکەی بۆ هەبێت ، ئینجا ئەگەر لە رسول الله ـەشەوە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەبێت بەڵام لە هاوەڵان ـیەوە بێت ئەوە نزیکترن لە حەق وەك لە ئێمە ، لەبەر ئەوەی الله تعالى وەسفی دوای ئەوانی کردووە بە شوێنکەوتنیان بۆ ئەوان ، فەرموویەتی : { وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ } [ التوبة : ١٠٠ ] ، بەڵام ئێوە دەڵێن : بەڵکو (قسەی هاوەڵان و دوای ئەوان) بەراورد ئەکەین بە ڕەئـ و تێگەیشتنی خۆمان لە قورئاندا ، جا ئەوەی پێکەوە گونجا قبووڵی ئەکەین ، ئەوەشی (لەگەڵ تێگەیشتن و ڕەئی ئێمە بۆ قورئان) نەگونجا قبووڵی ناکەین. جا مەبەست و ئامانجی هەموو بیدعەچیەک لە ئیسلامدا بریتییە لە : ڕەتکردنەوەی ئەو سوننەتانەی کە لەگەڵ ڕەئـ و تێگەیشتنیدا ناگونجێت.[1]

پێشەوا **ئەوزاعی** فەرموویەتی: زانست ئەو زانستەیە کە لە هاوەڵانی محمد رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـەوە هاتووە، گەر لەوانەوە نەهاتبێت ئەوە عیلم نییە.[2]

---

[1] النقض على بشر المريسي.

[2] تاريخ ديمشق.

پێشەوا **ئەوزاعی** دەفەرمووێ : خۆت پابەندی سوننەت بکە و وابەستەی بە و سەبری لەسەربگرە ، لەوێدا بوەستە کە سەلەفی پێش خۆت لێی وەستاون ، ئەوە بڵێ کە ئەوان گوتویانە ، واز لەوە بهێنە کە وازیان لێی هێناوە و لێی بێدەنگ بوونە ، شوێن ڕێگای پێشینی چاکەکارت (سلف صالح) بکەوە ، ئەوەی بۆئەوان بەس بوو بێت بۆ تۆش بەسە.[1]

ئیمام **احمد** (٢٤١هـ) لە دەسپێکی اصول السنة ـکەیدا دەفەرموێت:

[ أصول السنة عندنا التمسك بما كان عليه أصحاب رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ والاقتداء بهم، وترك البدع ، وكل بدعة فهي ضلالة ، وترك الخصومات في الدين ].

ئەصڵی دین لامان (واتە ئیجماعی هەموو زانایانی ئەهلی سوننە) دەستگرنە بەوەی کە صەحابە لەسەری بوون رضي الله عنهم ، و ئیقتیدا کردن پێیانەوە و شوێنکەوتنیان ، و وازهێنان لە بیدعە (داهێنراو لە دین) هەموو داهێنانێک لە دیندا گومڕاییە ، و وازهێنان لە ناکۆکی و مشتومڕ لە دین.

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَلَا نَتَعَدَّى الْأَثَرَ وَالِاتِّبَاعِ. فَالِاتِّبَاعُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وَمِنْ بَعْدِهِ لِأَصْحَابِهِ.

---

[1] شرح اصول اعتقاد للالكائي:٣١٥.

**أبو عبدالله** ووتی : لانادەین لە ئەثەر و شوێنکەوتن، شوێنکەوتن بۆ رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـە ، وە بۆ هاوەڵانی پاش ئەوە رضي الله عنهم.[1]

## پرسیار فەهمی سەلەف واتای چی ؟

لەوەڵامدا بزانن ڕەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتان.

فەهمی سەلەف واتە تێگەیشتنی (خير القرون) بۆ دین چۆن بووە ئێمەش ئاوا لێی تێبگەین ، واتە تێگەیشتنی پێشەوا ئەحمەد و مالیك و شافیعی چۆن بووە بۆ دین ئێمەش بەو شێوە لێی تێبگەین بۆیە پێویستە جگە لە تێگەیشتنی ئەوان هیچ تێگەیشتنێکی تر پێش نەخرێت ، هەروەها هەر تێگەیشتن و لێکدانەوەیەك لەدین و بیروباوەڕ پێچەوانەی تێگەیشتنی ئەوان بوو ئەوە وەرناگیرێ و ڕەفزە بەهەموو جۆرێ.

فەهمی سەلەف واتە گەڕانەوە بۆ کتێب و تەفسیری سەلەف.

فەهمی سەلەف واتە پەروەردەبوون لەسەر کتێب و بیروباوەڕی ئەوان.

ولله الحمد کۆتایی قۆناغی یەکەم لە پێگەیاندنی مەنهەجی لە بیروباوەڕدا ، بەشی ناسینی خيرالقرون.

---

[1] السنة للخلال.

## بەشی پێناسەو تێگەیشتن لە بنەماو مەنهەجی ئەهلی سوونانە.

**پرسیار : مەبەست چیە لە (أصول السنة) یان (السنة) لەبابی عەقیدە (بیروباوەڕ) ؟**

وەڵام : بزانن ڕەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتان.

گەر بگەڕێینەوە بۆ کتێب و نامیلکەکانی سەلەفی ئوممەت کەوا لەسەر باسی عەقیدە و بیروباوەڕ دەبیندرێ ناویان (السنة) یان (أصول السنة) ـیە .

وەکو : سوننەی پێشەوا عبدالله کوری ئیمام ئەحمەد.

سوننەی پێشەوا خەلال.

سوننەی پێشەوا حرب الكرماني .

لە نامیلکە عەقیدەیەکان وەکو :

أصول السنة ـی إمام أحمد.

أصول السنة ـی الحميدي .

أصول السنة ـی المزني.

أصول السنة ـی البربهاري.

زۆرێکی تر هەن ئەو ناوانەیان کراوەتە بەر ، بۆیە پێویستە خوێنەری بەڕێز بزانێت چ مانایەکی هەیە و چ شتێك ئەگرێتەوە.



## پێناسەی أصول ئینجا سوونننه

★ **أصول** = أصل : ئەو بنەمایەیە کەوا شتی تری لەسەر بنیات ئەنرێ وەك ئەڵێن : بناغە ، بناغەی خانو چەندین ژوور و قاتی لەسەر بونیات دەنرێ ، بۆیە ئەو ئەسڵە ئەگەر خەراپ بێت تێکڕای خانوەکەت لێ وێران ئەکات.

کەواتە : ئەتوانین بڵێین بنەما و بناغەی مسوڵمان بیروباوەڕەکەیەتی گەر بێت و بیروباوەڕێکی پاك و دوور لە لادان و مخالەفەی مەنهەج بێ ، ئەوە تێکڕای کارو کردەوەکانی ئەنجامی ئەدا قبوڵ کراوە و پەسەند ئەکرێ إن شاء الله ، گەرنا بناغەکەی کە بیر و باوەڕەکەیەتی دەبێتە هۆی لەنێوبردن و وێرانکردنی سەرجەم کردەوەکانی تری.

★ **السُّنَّة** : ڕێگا ، مەنهەج کەوا خەڵکی شوێنی ئەکەون.

★ لەڕووی شەرعەوە : واتە ڕێگا و ڕێبازی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و هاوەڵان.

★ السنة : مانایەکی گشتگیرە هەموو شتێك ئەگرێتەوە لە عیبادەت و بەندایەتی و ڕەوشت ...هتد.

پێشەوا **بەربەهاری** لە شەرحی السُنة دەڵێ : بزانە سوننەت واتا ئیسلام ، ئیسلامیش واتە سوننەت .

وشەی السنة : مانای دەگۆڕێت بە پێی باس و بابەتەکان ، بۆ نموونە : لە بابی فیقھ ، لە بابی عیبادات.

ئەوەی لێرەدا مەبەستە لەم وشە لای پێشەوایانی سەلەف کەوا بەکاریان هێناوە (تایبەتە بە بیروباوەڕ) ، واتە : (بنەما و بناغەی بیروباوەڕ).

**أبو بكري صديق** رَضِيَ اللَّهُ عَنْه ئەفەرموویت : سوننەت گوریسی بەهێزی اللەیە ، هەرکەس وازی لێبهێنیت ، ئەوە ئەو گوریسەی لە نێوان خۆی و اللەدایە پچڕاندووە.[1]

ئیمام **أحمد بن حنبل** فەرموویەتی : أصول السنة عندنا التمسك بما كان عليه أصحاب رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ والإقداء بهم. بنەما و بناغەی سوننەت لەلای ئێمە بریتییە لە دەست گرتن بەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەسەری بونە ، وە چاولێکردن و پێشەنگ بوون پێیانەوە.[2]

پێشەوا **بەربەهاری** ئەفەرموویت : ئەو ئەساسەی کە جەماعەتی لەسەر بونیات ئەنرێ بریتییە لە هاوەڵانی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، الله رەحم بەهەموویان بکا

---

[1] الإبانة الصغراء / ٥٣ .

[2] صول السنة للإمام أحمد بن حنبل.

، ئەوان ئەهلی سوننە و جەماعەن ، هەرکەس لەوان وەری نەگرێ ئەوا گومڕا بووە و بیدعەی کردووە ، هەموو بیدعەیەك گومڕاییە و گومرای و ئەهلەکەشی بۆ ئاگرن.[1]

**شەعبی** ( ١٠٣ هـ ) ئەفەرموویت : هەرشتێك لە هاوەڵانی رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆت گێڕدرایەوە وەریگرە و لەسەری بڕۆ ، هەرشتێکیش لە غەیری ئەوان بۆت گێڕدرایەوە بیخە شوێنی پیساییەوە.[2]

## پرسیار ئێمە پێویستە شوێن چ مەنهەج و شتێك بکەوین ؟

لەوەڵامدا : بزانە رەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتان .

پێشەوا **أبو حاتم الرازي** ئەفەرموویت : مەزهەب و هەڵبژاردەی ئێمە ، شوێنکەوتنی پێەمبەری اللەیە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وە هاوەڵەکانی وە تابعین وە ئەوانەی دوای ئەوان دێن بە چاکە.[3]

---

[1] السنة لحرب الكرماني.

[2] الإبانة الكبرى: ١ صـ ٢٤٨ / رقم الأثر ٦٣٣.

[3] أصول اعتقاد للالكائي : ١/ ١٣٩.

پێشەوا **إسحاق بن راهويه** ئەڵێت : ئێمە شوێن کەوتە و چاولێکەری پێشەوا و پێشینە کۆنەکانمانین شتێك داناهێنین کەوا لە کتابی اللەدا نەبێت ، یان لە سوننەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەبێت یان هیچ پێشەوایەك نەی ووتبێ.[1]

پێشەوای بەڕێز ئیمامی **الأوزاعي** ئەفەرمووێت : ئارام بگرە لەسەر سوننەت ، لەوێدا بووەستە کە تێیدا وەستاون (مەبەستی صەحابەیە) ، لەوەدا قسە بکە کە ئەوان قسەیان تێداکردووە ، ئەوەندە بڵێ کە ئەوان ووتویانە ، ڕێگای سەلەفی صالحی خۆت بگرەبەر ، چونکە ئەوەی بۆ ئەوان بەس بووبێت بۆ تۆش بەسە.[2]

هاوەڵی بەڕێز **عبدالله بن مسعود** رَضِيَ اللَّهُ عَنْه ئەیفەرموو : ئێمە شوێنکەوتەین و شوێن رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەکەوین و داهێنەر نین و شت لە دیندا داناهێنین ، وە گومڕاش نابین هەتا دەستگرتوبین و شوێن ئەثەر بکەوین.[3]

پێشەوای بەڕێز و تابعی **شەعبی** ئەڵێ : هەرشتێك لە هاوەڵانی رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆت گێڕدرایەوە وەری بگرە و لەسەری بڕۆ ، وە هەرشتێکیش لە غەیری ئەوان بۆت گێڕدرایەوە بیخەرە شوێنی پیساییەوە.[4]

---

(1) السنة للخلال : صـ : ٢١٣.

(2) جامع عقائد ا ١ صـ ٩٨ رقم الأثر ٤.

(3) الإعتقاد لالكائي : ١٠٥.

(4) الإبانة الكبرى : ٦٣٣.

**بقية بن الوليد** رحمة الله ئەڵێ : الأوزعي رحمه الله پێی ووتم : ئەی بقية عيلم ئەوەیە کە لە هاوەڵانی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هاتووە ، ئەوەی لەوانەوە نەهاتبوو عیلم نییە.[1]

**عباد بن العلوم** ئەڵێت : شريك بن عبدالله هات بۆ لامان نزیکەی پێنج ساڵ پێش ئێستا ووتی : پێم ووت : ئەی أبا عبدالله ئێمە قەومانێکمان لایە لە معتزیلە ئینکاری ئەم حدیثانە ئەکەن ؟ ووتی : نزیکەی دە حدیثی لەو بابەتە بۆ باس کردم وە ووتی : ئێمە ئەم دینەمان لە تابعین و هاوەڵانی رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەرگرتووە ئەی ئەوان لە کێیان وەرگرتوە ؟![2]

**رسول الله** صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەفەرمووێت : ئەهلی کتاب دابەش بوون بەسەر حەفتا و دوو گرووپدا ، وە ئەم ئوممەتەش دابەش دەبێت بەسەر حەفتا و سێ گروپدا ، واتە : الأهواء ، وە هەموویان لە ئاگردان ئیللا یەك دانەیان نەبێت کە ئەویش (الجماعة) یە.[3]

**المسيب بن واضح** ئەڵێت : گوێم لە يوسف بن أسباط بوو دەیووت : بنچینەیی بیدەع چوارە : الروافض ، والخوارج ، والقدرية ، والمرجئة ، دواتر ئەمانە هەر

---

[1] تاريخ الدمشق ٢٠١ / ٣٥.

[2] السنة عبدالله : ٤٩٤.

[3] الرد على المبتدعة / ١٥.

یەکێکیان هەژدە گرووپیان لێ بۆتەوە وە ئەمەش حەفتا و دوو گرووپە ، وە حەفتا و سێیەمینیشیان الجماعة ـەیە ئەوەی کە رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی ئەوانە کۆمەڵەی ڕزگار بوون.[١]

کەواتە بزانن رەحمەتی الله تان لێبێ:

تێگەیشتن لەوەی ئێمە پێویستە شوێن مەنهەجی (خير القرون) بکەوین ، دین ئەوەیە لەوان هاتبێ ، باشترین ڕێگاش بۆ گومڕانەبوون ئەوەیە بگەڕێینەوە بۆ ئەوان.

## پرسیار : پێشەوایانی سەلەف ئێمەیان لە چ کەسانێك ئاگادار کردووتەوە ؟

لەوەڵامدا بزانن رەحمەتی الله برژێ بەسەرتان.

پێشەوا ( **إبن أبي حاتم** ) ئەڵێ : گوێم لە باوکم و أبا زرعة بوو:

يأمران بهجران أهل الزيغ والبدع ، ويغلظان رأيهما أشد التغليظ ، وينكران وضع الكتب بالرأي في غير آثار.

أبو محمد فەرموویەتی : گوێم لە باوکم و أبو زرعة بوو فەرمانیان ئەکرد بە دوورکەوتنەوە و هەجرکردنی ئەهلی زیغ و بیدعە ، وە ڕقیان لە بۆچوونەکانیان

[١] الرد على المبتدعة / ١٦.

بوو بە توندترین ڕق لێبوونەوە ، وە ڕێگربوون لە دانان و نووسینی کتێب بە بیرووبۆچوونی خۆت بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەثەر.[١]

**فوضەیلی کوڕی عیاض** فەرموویەتی : دامەنیشە لەگەڵ خاوەن بیدعە ، چونکە بەڕاستی من دەترسم نەفرەت دابەزێتە سەرت بەهۆی دانیشتنتەوە لەگەڵی.[٢]

**أبو قلابة** دەیووت : لگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دامەنیشن ، وە مشتومڕ و مناقەشەیان لەگەڵدا مەکەن ، چونکە من ئەمین نیم لەوەی کە بتانخاتە ناو گومڕاییەکەیانەوە ، یاخود ئەوەتان لێ بشێوێنن کە ئەیزانن.[٣]

**هشام بن عروة** لە غەیری ئەوە ڕیوایەتی کردووە ، ووتی:

هەرکەسێك ڕێزی هاوەڵێکی بیدعە بگرێت [ بەگەورە سەیری بکات و لەگەڵیان دابنیشێ ] ئەوا یارمەتی داوە بۆ ڕووخاندنی ئیسلام.[٤]

کەواتە بزانن ڕەحمەتی الله تان لێبێت : ئەوەی پێویستە لێی دووربین ئەهلی بیدەع و بیدعەکەیە ، بۆیە پێویستە لەسەرت وەکو ئەهلی سوننە گەر یەکێ

---

[١] عقيدة الرازيين.
[٢] أصول اعتقاد السنة للالكائي : ١/٢١٥.
[٣] الرد على المبتدعه ٢٤ .
[٤] الرد على المبتدعة ١٣ .

سوننەت نەبوو لێی دوور بی و هەجری بکەی بەهەموو جورێ تا دەگەڕێتەوە سەر سوننەت.

**پرسیار: پێشەوایانی سەلەف پێمان دەڵێن لە چ شتێک دوور بکەوینەوە ؟**

لەوەڵامدا بزانن ڕەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتان.

**لە ئەسەری سەلەفی ئوممەت:**

**عبدالرحمن بن أبي ليلى** ئەڵێت : هەرگیز دەمەتەقێ و مشتومڕ ناکەم لەگەڵ براکەم ، چونکە یان بەدرۆی دەخەمەوە یان تورەی دەکەم.[١]

**عمر بن عبدالعزيز** دەڵێت : خۆشبەختی بۆ ئەوەی کەوا پارێزراوە لە دەمەتەقێ و تورەبوون وە چاوچنۆکی.[٢]

**مسلم بن يسار** ئەڵێت : ئامان ووریای دەمەتەقێ و مشتومڕ بن چونکە کاتی جەهل و نەزانینە.[٣]

---

[١] الآداب الشريعة لابن مفلح : ١ / ١٨.

[٢] البداية والنهاية لابن كثير : ٩/٢٣٤.

[٣] أخلاق العلماء الآجري ص : ٥٧.

**ئەوزاعی** ئەڵێت : گەر خوای تعالى شەڕ و خەراپەی بۆ گەلێك بوێتن خەریكیان دەكات بە مناقەشە و مشتومڕ و ڕێگریان لێئەكات لە كردەوە.[1]

**محمد بن الحسين** دەڵێت : لە سیفەتی كەسانی جاهیل مناقەشە و دەمەتەقێ و مشتومڕ و بردنەوەیە.[2]

**وقال الشافعي** : ( المراء في العلم يقسي القلوب ، ويورث الضغائن ) پێشەوا شافعی ئەڵێت : دەمەتەقێ و مشتومڕ لە عیلمدا دڵ ڕەق دەكات ، وە ڕق و كینەش بەرهەم دەدات.[3]

بەهەمان شێوە لە پێشەوا مالیكیشەوە هاتوە .

تابعی **أبو قلابة الجرمي** دەڵێ : ئاگاداربن خۆتان بپارێزن لە ئاهلی مشتومڕ و جدال ، من ئەمینتان ناكەم لەوەی كە نوقمتان بكەن لە گومڕای خۆیاندا ، یان شتێكیان لێ تێكەڵ بكەن كە دەیانزانن و ڕوونە لاتان.[4]

كەواتە : بەهەموو شێوەیەک ئەو شتە زەم كراوە لە قورئان و سوننەت و ئەسەری سەلەف ، بۆیە پێشەوا ئەحمد خستوتیە بنەماكانی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە ، واتە

---

[1] آداب الشريعة لابن مفلح : ١/٢٠٢ .

[2] أخلاق العلماء الآجري ص : ٦٣.

[3] آداب الشريعة لابن مفلح : ١/٢٠٢.

[4] الإبانة الكبرى لابن بطة : ٣٤٩.

تۆ لەسەر سوننەتی ئەگەر پشتت تێکرد و پێچەوانەی سوننەتی ئەگەر ڕووت تێی کرد و ئەنجامت دا.

## پرسیار : چۆن بزانین بەرامبەر لەسەر مەنهەجی سەلەفە ؟

لەوەڵامدا بزانە ڕەحمەتی الله بڕژێ بە سەرتان.

پێش هەموو شت ئەبێت ئەوە بزانن هەموو چین و کەسێك بانگەوازی ئەوە ئەکات کەوا لەسەر مەنهەجی سەلەفە و بەخۆشیان ئەڵێن : ئەهلی سوننە.

بەڵام بێگومان بە ووتن و بانگەوازی وان هیچ شتێ لە باسەکە ناگۆڕێت ، چونکە شوێن کەوتنی سەلەف مەنهەجە نەك ناو.

**بە شێوەیەکی ئاسان پێتان ئەڵێم:**

★ ئەگەر هاتو خوێنەری کتێبەکانی سەلەف بوو.

★ ئەگەر هاتوو لەکاتی قسە و بەڵگە هێنانەوە لە باسە عەقیدەییەکان پشتی بە کتێبەکانی سەلەف بەست کە بە قورئان و سوننە وەکو : کتێبەکانی سوننەی عبداللەی کوڕی ئیمام ئەحمەد ، سوننەی خەللال ، سوننەی حرب الكرماني ، سوننەی المرزي ، و أصول السنة ـی ئیمام ئەحمەد ، و الشريعة الآجري ، و شرح ی سوننەی بەربەهاری ، و عقيدة الرازيين ، و الحميدي ، و شرح السنة ـی موزەنی ، و إبانة الكبرى والصغرى لإبن بطة ، شەرحی لالەکائی کۆمەڵێکی تر.

ئەوانە لە باسە عەقیدەیەکان ، بۆ نموونە ئەڵێی :

سەلەف هەرکەسێك ووتبێتی قورئان مەخلوقە تەکفیریان کردووە بەدیاری کراوی و گشتی تەواو پاڵپشت بە بەڵگەکانی ئەو کتێبانەی کەوا ناوم هێنان.

بەڵام ئەگەر یەکێك لە بەڵگە هێنانەوەی ئیعتیقادی گوتی فلان زانای متأخرين و فلان لە خەلەف وا ئەڵێن ، ئەوا بە فیعلی و کردەیی لەسەر مەنهەجی سەلەف نییە ، هەروەها لەسەر کتوبی سەلەف پەروەردە نەبووە.

★ واتە :کاتێک ووتت چیت خوێندووە لە تەڵەبی عیلم دا ؟ ئەگەر ئەوانەی ووت و لای مامۆستایەکی ئەهلی سوننەی خوێندبێ ئەوا بێگومان وەکو ڕووکەش و زاهیری ئەوە ئەڵێین : لەسەر مەنهەجی سەلەفە.

لەهەمان کاتدا دەکرێ کەسانێک هەبن ئەو مەرجانەی هێنام تێیدا بوو ، لەهەمان کاتیشدا لەلایەنێک گومڕابووبێ ، وەکو ئەو کەسانەی خۆیان بە ئەهلی ئەسەر و حەدیس داناوە ، بەڵام تەکفیری پێشەوا بوخاری و ابن خزیمە و زۆرێکی تر دەکەن لە سەلەف ، هەروەها تەکفیری عامی هەموو خەڵك دەکەن ، ئەوانە پێیان دەڵێن : عمومی و لادەر لەمەنهەجی خيرالقرون.

بۆیە لەخۆتان تێک مەدەن و باسەکە کەمێ وردە.

★ ئەمەـی باسم کرد وەکو کارتێکی دی ئێن ئەیە و هەموو شتێکت لەسەر ئاسان ئەکات ، چونکە هەر لەکاتی موناقەشە و مونازەڕە و شتی وا تێدەگەی هیچت لێ وەرناگرێ چونکە پاڵپشت نییە بە مەنهەجی سەلەف .

بۆ وەڵامدانەوەی تەواوی ئەم پرسیارە لە قۆناغی چوارەم ئەچینە سەر کۆدەنگی ئەهلی سوننە لەسەر بیروباوەڕ ، هەر کەس و تاکێك بەو شێوە بوو ئەوا ئەهلی سوونەیە زاهیری ، لەگەڵ ئەو نیشانانەی سەرەوە کە باسم کرد.

ولله الحمد والمنة قۆناغی دووەم کۆتایی هات لە پێگەیاندنی مەنهەجی.



## بەشی بنەماکانی ئیسلام و ئیمان و شیکردنەوەی شەهادەت هێنان.

دوو جۆر روکنمان هەیە:

١ : ئەرکانی ئیسلام.

٢ : ئەرکانی ئیمان.

١ : **ئەرکانی ئیسلام پێنجن:**[١]

١ : شاهێدی دان و دانان بە (لا إله إلا الله) وە بە (محمد رسول الله).

---

[١] بەڵگە : عَنِ ابْنِ عُمَرَ [رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَ] عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (**بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ : عَلَى أَنْ يُوَحَّدَ اللَّهُ ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ ، وَصِيَامِ رَمَضَانَ ، وَالْحَجِّ**). فَقَالَ رَجُلٌ : الْحَجُّ وَصِيَامُ رَمَضَانَ؟ فقَالَ : لَا ، صِيَامُ رَمَضَانَ وَالْحَجُّ ، هَكَذَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ متفق عليه.

واتە : ابن عمر [خوای لێ ڕازی بێت] دەڵێ : پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی : (ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە : خوا بەیەك بناسیت ، نوێژ بکەیت ، زەکات بدەیت ، ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت ، حەج بکەیت) پیاوێك وتی : حەج و ڕۆژووی ڕەمەزان؟ لەوەڵامدا وتی : نەخێر ، ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج ، بەم شێوەیە لەپێغەمبەرم صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بیستووە.

٢ : نوێژکردن.

٣ : زەکات دان.

٤ : ڕۆژ و گرتن.

٥ : حەج کردن گەر توانای هەبێ.

٢ : **ئەرکانی ئیمان شەشن**:[١]

١ : باوەڕ هێنان بە الله عزوجل.

٢ : باوەڕ هێنان بە فریشتەکان.

٣ : باوەڕ هێنان بە کتێبە ئاسمانیەکان.

٤:باوەڕ هێنان بە پێغەمبەران.

---

[١] بەڵگە : عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ [رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ] قَالَ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا بَارِزًا لِلنَّاسِ ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ ، يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ : (**أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ ، وَمَلَائِكَتِهِ ، وَكِتَابِهِ ، وَلِقَائِهِ ، وَرُسُلِهِ ، وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الْآخِرِ**).

واتە : ابوهریرە [خوای لێ ڕازی بێت] دەفەرمووێ : ڕۆژێك پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەناو خەڵکیدا دەرکەوت ، پیاوێك هاتە خزمەتی و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا باوەڕ چیە؟ فەرمووی : (باوەڕت هەبێت بەخوا ، بەفریشتەکانی ، بەکتێبەکانیژ، بەدیدارو بەخزمەت گەیشتنی ، بەپێغەمبەرانیی، هەروەها باوەڕت هەبێت بەزیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت).

لەزۆرینەی لەفزەکانی تر قەدەر هاتووە.

٥ : باوەڕ هێنان بە ڕۆژی دوایی.

٦ : باوەڕ هێنان بە قەدەر بە خێر و شەڕی.

**لێکدانەوە بۆ ئەرکانی ئیسلام:**

١ : شاهێدی دان و داننان بە ( لا إله إلا الله ) وە بە ( محمد رسول الله).

٢ : نوێژکردن.

٣ : زەکات دان.

٤ : ڕۆژ و گرتن.

٥ : حەج کردن گەر توانای هەبێ.

**ئەم پێنجەی سەرەوە پایەیی ئیسلامن:**

★ مەرجی قبوڵ بوونی ئەم چوارپایەیە (نوێژکردن ، زەکات دان ، ڕۆژ و گرتن ، حەج کردن گەر توانای هەبێ).

بریتیە لە : شاهێدی دان و داننان بە (لا إله إلا الله)

وە بە (محمد رسول الله).

ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە واتە : هەرچی عیبادەتە تۆ دەیکەی پەیوەستە بەوەی ئایا شاهێدی دانت بۆیان تەواوە و ڕاستە یان نا ؟ چونکە ، شیرك و کوفر بەتاڵی ئەکاتەوە.

زۆرینەی خەڵك چوارپایەیی باسمان کرد ئەنجامی ئەدەن ، بەڵام لە پایەیی یەکەم کە گرنگترین و لە پێشترینیانە ، تێی کەوتوون .

دواتر لەبەر گرنگی پایەیی یەکەم زۆر بە ووردی شرۆڤەی دەکەین .

شاهێدی دان زارەکییە و پەیوەستە بە ناخەوە ، بەڵام ئەوانی تر کردەوەن وەکو : (نوێژکردن ، زەکات دان ، ڕۆژ و گرتن ، حەج کردن گەر توانای هەبێ).

لەم چوار ئەرکانەی ئیسلام (نوێژ) لە پێشینەی هەموویانەگەورەترین و گرنگترین کردەوەیە لە ئیسلام ، بۆئەوەی بناسرێی بەوەی موسڵمانی و لە کوفرو شیرکیش بەدەر بی.

نەکردنی نوێژ لە دین دەرخەرە.[١]

---

[١] بەڵگە پێشەوا ئەحمەد دەڵێ :

(وَمن ترك الصَّلَاة فقد كفر) (وَلَيْسَ من الْأَعْمَال شَيْء تَركه كفر إِلَّا الصَّلَاة) من تَركهَا فَهُوَ كَافِر وَقد أحل الله قَتله .

=

= هەریەك واز لەنوێژ بهێنێت ئەوا کافر بووە ، هیچ کردەوەیەک نیە وازی لێ بهێنرێ کوفر بێ تەنیا نوێژ نەبێتن ، هەریەک وازی لێبێنیت ئەوا کافرە ، اللەتبارک وتعالی لەنێو بردنی حەڵاڵ کردووە.

پێشەوا **ئەبو داود** لە سنن لە کتاب السنة بابێکی داناوە بەناوی: بَابٌ : فِي رَدِّ الْإِرْجَاءِ

حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ ، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (**بَيْنَ الْعَبْدِ وَبَيْنَ الْكُفْرِ تَرْكُ الصَّلَاةِ**).

[مسلم: ٨٢, الترمذي: ٢٦١٨, النسائي: ٤٦٤, ابن ماجه: ١٠٧٨, سنن الدارمي: ١٢٦٩, مسند أحمد: ١٤٩٧٩.]

واتە ڕەددانەوەی ئەهلی ئیرجائـ ئینجا ئەو فەرموودەی هێناوە دەفەرموێ : لەنێوان بەندە و نێوان کوفر دا وازهێنانە لەنوێژ.

ئیمامی الترمذي بەو شێوانەش هێناویەتی:

**بَيْنَ الْكُفْرِ وَالْإِيمَانِ تَرْكُ الصَّلَاةِ ."**

**بَيْنَ الْعَبْدِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ - أَوِ الْكُفْرِ - تَرْكُ الصَّلَاةِ ."**

پێشەوا **ترمذي** لە سنن ئیجماعێک نەقڵ دەکات لە عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ الْعُقَيْلِيِّ قَالَ : كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَرَوْنَ شَيْئًا مِنَ الْأَعْمَالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ غَيْرَ الصَّلَاةِ).

سنن الترمذي ٢٦٢٢ ، تعظيم القدر الصلاة ٩٤٨ ، والإيمان لإبن أبي شيبة ١٣٧.

واتە هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وازهێنانی لە هیچ کردەوەیەکیان بە کوفر نەدەبینی جگە لەنوێژ نەبێت ، کەوا وازهێنانی کوفرە.

**مجاهید** دەڵێ : بە جابری کوڕی عبداللەم گووت : چ شتێک جیاکەرەوەی نێوانی کوفر و ئیمان بوو لاتان لە کردەوە لەسەر دەمی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ فەرمووی : نوێژ).

تعظيم قدر الصلاة للمرو ذي ٨٩٣. =

## لێکدانەوەی کورت بۆ پایەکانی ئیمان

١: باوەڕ هێنان بە الله عزوجل.

٢: باوەڕ هێنان بە فریشتەکان.

٣: باوەڕ هێنان بە کتێبە ئاسمانیەکان.

٤: باوەڕ هێنان بە پێغەمبەران.

٥: باوەڕ هێنان بە ڕۆژی دوایی.

٦: باوەڕ هێنان بە قەدەر بە خێر و شەڕی.

ئەمانە پەیوەستن بەناخەوە ، دەکرێ کەسێك بەدەم بیڵێ و لەناخەوەش ڕاستگۆ نەبێ.

---

= **یزید الرقاشي** دەڵێ : بە (أنس بن مالک)م گووت : ئالێرانەدا کەسانێك هەن شاهێدی کوفرمان لەسەر دەدەن و شەفاعەتیش بەدرۆ دەخەنەوە و حەوزیش ، ئایا شتێکت لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بیستوە لەو بارەوە ؟
فەرمووی : بەڵێ گوێم لێی بوو دەیفەرموو : لەنێوان بەندە و کوفر وشیرکدا نوێژە ئەوەی وازی لێبێنێت شرکی بڕیار داوە).
تعظیم قدر الصلاة ٨٩٨ -٩٠٠
دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە : یزید بن أبان الرقاشي لاوازە.

بڕوا نەهێنان بە یەکێکیان پێی لەدین دەرەچێت ، تەنها بەشی قەدەر نەبێ ، ئەویش کەمی وردەکاری تێدایە ، بەشێك لەزانایان دەڵێن : دوای ئەوەی نکۆڵی زانستی اللەی کرد ئەوکات.



# شرۆڤە كردنی مانای شەهادەت هێنان

مانای (شهادة أن لاإله إلا الله) یان وحده لاشريك له:

واتە : دان بەوە دەنێم جگە لە الله عزوجل هیچ پەرستراوێكی تر نیە بەحەق بپەرسترێتن جگە لەو نەبێتن.

واتـە : (لامعبود بحق إلا الله) واتە (لا إله إلا الله) هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق شایستە بێ بۆ پەرستن ، جگە لە الله عزوجل.

ئەمە وشەی یەكخواپەرستیە ، كەوا هەموو پێغەمبەران بێ جیاوازی لەو پێناو نێردراون.[1]

---

[1] بەڵگە خوای تەعالا دەفەرموێ:

{ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ }.

پێشەوا **إبن جرير** لە تەفسیری ئەو ئایەتە ئەڵێ:

واتە : ئەی خەڵكی بەڕاستی بۆ هەموو گەلانی پێش ئێوەمان ناردووە پێغەمبەرێك ، وەكو چۆن بۆ ئێوەمان ناردووە ، بەوەی الله پەرست بن بەتەنها ، هیچ هاوبەشێكی بۆ پەیدا نەكەن ، گوێ ڕایەڵیان تەنهابۆ ئەو بێت ، و هەروەها عیبادەتیان بەتەنها بۆ ئەوبێتن.

دەبێ دوور بكەونەوە لەهەموو شتێكی تر كەوا:

بكرێتە پەرستراو ، و عیبادەت و گوێ ڕایەڵی بۆ بكرێتن جگە لەو ( اللّٰه جَلَّ جَلَالُهُ ). =

## پێناسەی ووشەی یەکخواپەرستی

تۆ ئەڵێی: (لا إله) واتە هیچ پەرستراو و ئیلاهێکی تر ، یان خوایەك نیە ، لێرە نەفیت کردووە بەگشتی ، تۆ لەو دەربڕینە دا (بەرائەت) ئەکەی لەهەموو ئیلاهـ و خوایەك بەگشتی ، لێرەدا ئیمان دانامەزرێت هەتا ئەوکاتەی ئەڵێی : (إلا الله).

لەجیاتی ووشەی یەکتا پەرستی پێویستە ووشەی یەکخواپەرستی بەکاربێتن.

تەنها بەخوێندنەوەی ئەم ووشە تێدەگەی مەبەستی سەرەکی چیە ، (یەك ، ووشەی یەك زیاتر نا!) یەك خوا ئەپەرسترێ بەحەق شایستە بێت بۆ پەرستن ئەویش (الله) یە.

### مەبەست لە نەفی و ئیسپات چیە ؟

**نەفی کردن واتە** : ڕەتکردنەوەی هەرچی شتە جگە لە الله بپەرسترێ وەکو : دار بێ یان بەرد بێ ، یان قەبر بێ ، یان شەخس بێ ، یان خۆر و مانگ و هەموو ئەو شتانەی دەپرسترێن بەبیانوەك لە بیانوەکان.

---

= [ لاإله إلا الله ] واتە (التوحید) بەمانای یەکخواپەرستی دێ ئەو وشەی کەوا (جین و ئینس) لە پێناوی درووست کراون الله دەفەرموێ : { وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ } [ الذاريات : ٥٦ ].

**ئیسپات کردن** : واتە : دووپاتی دەکەیتەوە تەنها الله عزوجل دەپەرسترێ و گوێ ڕایەڵی بۆ دەکرێ و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکرێ و ملکەچی دەبی ، دووپاتی دەکەیتەوە کە تەنها ئەو شایستەیە بەحەق.



## مەرجەکانی لا اله الا الله

| | |
|---|---|
| ١ - العلم : زانست و زانیاری | پێچەوانەی نەزانیە |
| ٢ - اليقين : دڵنیایی تەواو | پێچەوانەی گوومانە |
| ٣ - القبول : وەرگرتن | پێچەوانەی ڕەتکردنەوەیە |
| ٤ - الإنقياد : ملکەچ بوون | پێچەوانەی واز لێهێنانە |
| ٥ - الإخلاص : دڵسۆزی | پێچەوانەی هاوبەش و کوفرە |
| ٦ - الصدق : ڕاستگۆیی | پێچەوانەی درۆیە |
| ٧ - المحبة : خۆشەویستی | پێچەوانەی ڕق و بوغزە |

ئەمانە مەرج و پێویستیەکانن کە دەبێت لە هەموو موسڵمانێك هەبێت بەرامبەر ووشەی (لا إله إلا الله) ، نەبوونی ئەم مەرجانە وادەکات بەهیچ جۆرێ سوودت پێ نەگەیەنێت.

## ئایا هەرکەسێك بڵێ لا إله إلا الله دەچێتە بەهەشت ؟

لەوەڵامدا : ئەو باسە پێویستی بە ڕوونکردنەوەی ووردە ، فەرموودەکان کە هاتوون لەو بارەوە هەمووی صحیحن ، بەڵام پێویستیان بەوەیە خوێنەر تێبگەیەنرێت.

ڕاستە هەریەك بڵێ لا إله إلا الله دەچێتە بەهەشت.

ڕاستە نەڵێ لا إله إلا الله بەهیچ جۆرێ ناچێتە بەهەشت .

لەم باسەدا بەپووختی و کورتی باسی ئەوە دەکەین گەر یەکێك بڵێت ( لَاْ إِلٰهَ إِلاَّ اللّٰه) دەچێتە بەهەشت یان ئەم مەرجانە دەبێت تێیدابێت ، چەندین فەرموودە هەر لە (صحیحین) و لە (مسند) و (مصنف) ـەکانیش داهاتووە ئەگەر یەکێك بڵێت (لا إله إلا الله) دەچێتە بەهەشت وەکو ئەم فەرموودانە:-

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قُلتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ، مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ؟ فقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( **لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لَا يَسْأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ ؛ لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيثِ ، أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ خَالِصَةً مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ** ).

أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ ، مَاذَا رَدَّ إِلَيْكَ رَبُّكَ عَزَّ وَجَلَّ فِي الشَّفَاعَةِ؟ قَالَ: ( **لَقَدْ ظَنَنْتُ لَتَكُونَنَّ أَوَّلَ مَنْ سَأَلَنِي مِمَّا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْعِلْمِ ، شَفَاعَتِي لِمَنْ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ مُخْلِصًا ، يُصَدِّقُ قَلْبُهُ لِسَانَهُ ، وَلِسَانُهُ قَلْبَهُ** ).

فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( **يَاعَمِّ ، قُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللهِ** ).

عَن عِتْبَانَ بن مالكٍ رضي الله عنه: ( **فَإِنَّ الله قَدَ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا الله يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهِ الله** ).

لەم فەرموودانەدا کە لەچەند ئیمامێکەوەو بەچەند شێوەیەکی جیاواز هاتوون باس لە گرنگی (لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه) دەکاتن، بەڵام ئەوەی گرنگ بێت بۆتان ڕوونبکەمەوە یان وەك بیرهێنانەوەیەك ئەوەیە لەهەموو ئەم فەرموودە (محکم)ـانەی لەسەر ئەم ووشە هاتوون لەکۆتاییدا واتە لەکۆتا خاڵی فەرموودەکەدا مەرج دانراوە ، وەك لەیەکەم فەرموودەدا مەرجە ئەوەی دەڵێت من قال : (**لا إله إلا الله " خالصا"**) واتە یەکێکە لەمەرجە گرنگەکان کەوا تەنیاو تەنیا (قول) قسەو (عمل) کردگارن تا بیسەلمێنێت بۆ (الله) تعالی ـیەو لەدووەم بەهەمان شێوە کەوا لەدڵەوە ڕاستگۆبێت ، هەروەها زارەکی نییە ، هەریەك بڵێت (لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه) بچێتە بەهەشت، نەخێر هەرگیز ناچێتە بەهەشت گەر ئەم مەرجانەی تێدانەبێت

کەباسکراون والله أعلم ، یان لە فەرموودەی "عتبان بن مالك" کەدوورو درێژە من تەنیا ئەم باسەم لێ دەرهێناوە ، لێرەدا رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت : جەهەنەم حەرامکراوە لەسەر ئەوکەسەی بڵێت (لا إله إلا الله) ، بەڵام ئامانجی ڕەزامەندی الله تعالى بێت و دوور لە نیفاق بێت ، چونکە ئەم فەرموودە لەکاتێکدا بوو کە هاوەڵەکان ووتیان "مالك بن دخشن" موناففقە ، ئەویش پێی فەرموون (ألا ترون يقول لا إله إلا الله) واتە ئایا نابینن کەوا دەڵێت (لا إله إلا الله) بۆچی ؟ چونکە مونافیقەکان دەیانووت : (أشهد أنك محمد رسول الله) هەروەها الله تعالى لەسورەتی [ المنافقون ] ئایەتی یەکەم وەڵامی دانەوە و فەرمووی ، قال تعالى : { إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ }.

کەواتە دەبینین مونافق دەڵێت : (أشهد ان لا إله إلا الله وأن محمد رسول الله) بەڵام خوای تعالى پێیانی فەرموو : درۆ دەکەن ، بۆچی ؟ چونکە (عمل) کردگاریان پێ نییەو بەڕاستی و (قول) بەقسە وادەڵێن ، بەڵام لە (عمل) کردەوەدا پێچەوانەن و ڕاستگۆ نین لەگەڵ ئەم ووشەیەدا و موحبەتیشیان نییە ، چونکە ئەگەر خۆشەویستیان بۆ ئەم شهادەتە هەبێت وایان نەدەکرد ، بۆیە ووتنی (لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه) تەنیا قەول واتە قسەبێت ، بەڵام (عمل) کردەوەت پێی نەکردبێت نەخێر ، هەرگیز سوودت پێناگات.

لەکۆتاییدا تاکە بەڵگە یان حوججەی مرۆڤ لە قیامەت ئەم ووشەیەیە بەهەموو مەرجەکانیەوە وەك لەم فەرموودە.

فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( **يَاعَمِّ ، قُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللهِ** ).

لێرەدا رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەمامی (ئەبوتاڵیب) دەفەرمووێت : تەنیا بڵێ : (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ) تاوەکو ببێتە شاهێد و بەڵگەو حوججەیەك بۆت لای الله.

**چەن بەڵگەیەك لەئەسەری سەلەف:**

★ **أبا الحارث** ئەڵێت : بە أبو عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل ـم ووت : ئەگەر کەسێك بڵێت (لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه) ئیماندارە ؟

ووتی : (ئەوە لە سەرەتای ئیمانهێناندا بوو ، پاش ئەوە فەرزەکان دابەزین : نوێژ و زەکات و ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج).

★ **إبن شهاب الزهري** ئەڵێت : هشام بن عبدالملك ووتی : ئایا پێت گەیشتووە کە رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمانی بە بانگەرێك کردووە بڵێت : (هەر کەسێک بڵێت لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ئەوە بەهەشت بۆ ئەوە).

★ **الزهري** ئەڵێت : ووتم : (ئەوە پێش دابەزینی فەرزەکان بوو ، پاشان فەرزەکان دابەزین ، پێویستە خەڵکی کار بەوە بکەن کە الله عزوجل فەرزی کردووە لەسەریان) .

★ هەروەها لەلای **الضحاك** باسی ئەم باسەکرا : ( هەر کەسێك بڵێت لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ئەچێتە بەهەشتەوە ) ، الضحاك ووتی : (ئەمە پێش دانانی حدودەکان و دابەزینی فەرزەکان بوو).

گەربێت کەسێك بڵێ لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه لەسەر ئەو حاڵە بمرێ ئەچێتە بەهەشتەوە ، بەڵام (صدقا من قلبه) ڕاستگۆ بێ لەدڵەوە هەروەها فەرمودە لەو بارەوە زۆرن وەکو فەرموودەی:

**( أمرت أن أقاتل الناس؛ حتى يقولوا : لا إله إلا الله ، فإذا قالوها : حرمت علي دماؤهم وأموالهم إلا بحقها )** [ متفق عليه ]

فەرموودەی: عبادة بن الصامت: **من شهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأن محمدًا عبده ورسوله ، وأن عيسى عبد الله ورسوله ، وكلمته ألقاها إلى مريم ، وروح منه ، وأن الجنة حق ، والنار حق : أدخله الله الجنة على ما كان من العمل.** [ متفق عليه ] .

ئەو فەرموودانە ئەوە ئەسەلمێنن کەوا باسمان کرد ، بەڵام وەکو ئاماژەم پێدا ووتنی لەدڵەوە بێ ، ڕاستگۆ بێ و بێ هیچ هاوبەشێك.



## شرۆڤەكردنی وان محمد رسول الله

داننان و دووپات كردنەوەی شەهادەت هێنانی دووەم بە:

★ پێغەمبەرایەتی(محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ).

★ بەڕاست دانانی.

★ شوێن كەوتنی بەرنامەكەی (ڕێبازەكەی) كە ئیسلامە.

★ هەردووكیان (دوو شەهادەكە) پێكەوە گرێ دراوی یەكن هیچ كامێكیان بێ ئەوەی تریان تەواو نابێت هەروەها دانامەزرێتن ، واتە گەر یەكێ شاهێدی بدا بەوەی (أن لا إله إلا الله) بەڵام دان بەوە نەنێت كەوا (وأن محمد رسول الله) ئەوا سوودی بۆی نابێتن.

بەڵكو دەبێ هەردووكیان پێكەوە بن هیچ لادانێك نەبێ تێیدا چونكە تەوحید دانامەزرێتن .

تۆ دان بەوە دەنێی (محمدی كوڕی عبدلله كوڕی عبدالمطلب) پێغەمبەری الله یە.

هەروەها ئەڵێی : (عبد الله و رسوله) واتە : بەندەیەكە نەفسێكە ، مرۆڤێكە ، نەك مەلائیكەت بێت یان شتێكی تر ،{ سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ

الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا ۚ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ } [ الإسراء : ١ ].

شاهێدیت داوە بە پێغەمبەرایەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەزمان و گووفتار ، ئینجا وەکو شەهادەی یەکەم پێویستە بە کردەوە بیسەلمێنی ، بەوەی :

خۆشت بویێت : چونکە خۆشەویستی الله و پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێش خۆشویستنی دایك و باوك و برا و خووشك و منداڵەکانە ، ئەوانە دەبێ ڕێزلێگیراو بن بەپێی سنوری شەرعی بەتایبەت دایك و باوک کە واجبە لەسەر منداڵ بەهەموو شێوەیەك چاك بێ لەگەڵیان ، بۆیە پێغەمبەر ئەفەرموویێت :

**(لا يُؤْمِنُ أحدُكم حتى أكونَ أحبَّ إليه من ولدِهِ ، ووالدِهِ ، والناسِ أجمعينَ)** [ متفق عليه ].

واتە: ئیمانی تەواو نابێ ئەوکەسەی منی خۆشتر نەوێت لە منداڵ و باوان و هەموو کەسێك. واتە: بابەتی خۆشویستنی پێغەمبەر لەپێش هەموو خۆشەویستیەکی ترە ، نابێ موسڵمان هیچ کەسێکی تری وەکو ئەو خۆشبوێت ، تەنانەت نەفسی خۆشت ، چونکە خۆشویستنی ئەو بەشێکە لەتەواوکاری ئیمانی موسڵمان ، کە پێویستە هەیبێتن.

هاوەڵی بەڕێز **عمران بن حصين** فەرموودەی باسدەکرد لە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەیفەرموو : شەرم و حەیا تەنها خێر و چاکە دەهێنێت ، لەوکاتەشدا

بُشير بن كعب لای دانیشتبوو ، دەیگووت : نوسراوە لە تەورات شەرم و حەیا وایە و وایە ، عمران پێی فەرموو : من فەرموودەت لە پێغەمبەرەوە بۆ باسدەکەم ، تۆش لە کتێبەکەی خۆت ؟ سوێند بە الله هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم. [ متفق عليه ].

**عبداللـەی کوڕی هِشام** ئەڵێت : كُنَّا مع النَّبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ وهو آخِذٌ بيَدِ عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ ، فَقالَ له عُمَرُ : يا رَسولَ اللَّهِ ، لَأَنْتَ أحَبُّ إلَيَّ مِن كُلِّ شَيْءٍ إلَّا مِن نَفْسِي ، فَقالَ النَّبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ : لَا، والَّذي نَفْسِي بيَدِهِ ، حتَّى أكُونَ أحَبَّ إلَيْكَ مِن نَفْسِكَ ، فَقالَ له عُمَرُ : فإنَّه الآنَ ، واللَّهِ لَأَنْتَ أحَبُّ إلَيَّ مِن نَفْسِي ، فَقالَ النَّبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ : الآنَ يا عُمَرُ..

واتە : ئێمە لای پێغەمبەری الله بووین صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ ، کەئەو دەستی عومەری کوڕی خەتتابی گرتبوو ، عومەر پێی فەرموو : ئەی پێغەمبەر تۆ لەهەموو کەس خۆشەویستری لام ، تەنها لەنەفسی خۆم نەبێتن ، پێی فەرموو : نەخێر سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ، تائەوکاتەی خۆشەویستر دەبم لەنەفسیشت ، عومەر پێی فەرموو : سوێند بە الله تۆ لام خۆشەویستری لەنەفسیشم ، پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ پێی فەرموو : ئێستا ئەی عومەر.

واتە : هیچ بیانوەك هەڵناگرێت خۆشنەویستنی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، تەنانەت دەبێ لەنەفسیشت زیاتر بێت ، بۆیە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

فەرمووی : نەخێر سوێند بەوەی گیانی من بەدەستە تا ئەوکاتەی خۆشەویستر دەبم لەنەفسیشت.

بێگوومان خۆش ویستنی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە قسە نابێت بەتەنها ، بەڵکو دەبێ کردەوەی لەگەڵ بێتن ، چونکە کۆدەنگی پێشەوایانی ئەهلی سوننەی لەسەرە کەوا ئیمان قسە و کردارە.

خۆشویستنی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە شوێن کەوتنی سوننەتەکانیەتی.

زیندووکردنەوەی سوننەتەکانیەتی ، خۆشەویستیش بۆی شوێن کەوتنە بۆی ، بۆیە هاوەڵان ڕەحمەتی اللەیان لێبێ هێندە وورد بوون دوای پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، هەوڵیانداوە هەنگاو بەهەنگاو شوێن پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بکەون ، بەچ شتێك ؟

بێگوومان بە دووبارە کردنەوەی سوننەتەکانی و زیندوو کردنەوەیان ، وەکو هاوەڵی بەڕێز إبن عومەر ، کاتێ (نافع یان سالم) فەرموودە ئەگێڕنەوە لە (إبن عمر) لەزۆرینەی زۆری ئەڵێن : ئیبن عومەر ، ئەیکرد ، ئەنجامی دەدا ، تەنانەت کاتێ پێغەمبەر لەژیاندا بوو ، لەنێو مزگەوت دوو دەرگای لێ بوو فەرمووی : گەر ئەکرا ئەو دەرگایە بۆئافرەتان بوایە ، تاوەکو وەفاتی کرد هەرگیز ئەو دەرگایەیی بەکار نەهێناوە ، چونکە ئەوان بەکردەوە خۆشەویستیان بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دووپات ئەکردەوە ، بۆیە کاتێك پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کۆچ

ئەکات بۆ مەدینە ، هێندە خۆشەویستیان بۆی هەیە هاوەڵان ئەفەرموون : کاتێ دەستنوێژی ئەگرت ، ڕێگەیان نەئەدا ئاوی دەستنوێژ بکەوێتە سەر زەوی هەموویان دەستیان دادەنا.

لەفەرموودەی [ متفق عليه ] هاتووە لە (أبي جحيفة) ئەڵێ : هاوەڵان ئەو دەستنوێژەیان دەگرت و بەدەم و چاویان دەهێنا ئەوانەی بەریان نەدەکەوت لەپاشماوەی دەستی هاوەڵەکەیان دەگرت و بەدەم و چاویان دەهێنا ، بۆچی ؟ چونکە خۆشیان دەویست.



## بەشی ناساندنی تەوحید و کوفر و شیرك و پێناسەی زاراوەکان.

### پێناسەی ووشەی (التوحيد):

[ لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ] واتە (التوحيد) بەمانای یەکخواپەرستی دێ.

ئەو وشەی کەوا (جین و ئینس) لە پێناوی درووست کراون الله دەفەرموێ :

{وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ} [ الذاريات : ٥٦ ].

### پێناسەی ووشەی یەکخواپەرستی:

تۆ ئەڵێی : (لا إله) واتە هیچ پەرستراو و ئیلاهێکی تر ، یان خوایەك نیە ، لێرە نەفیت کردووە بەگشتی ، تۆ لەو دەربڕینە دا (بەرائەت) ئەکەی لەهەموو ئیلاهـ و خوایەك بەگشتی ، لێرەدا ئیمان دانامەزرێت هەتا ئەوکاتەی ئەڵێی : (إلا الله).

لەجیاتی ووشەی یەکتا پەرستی پێویستە ووشەی یەکخواپەرستی بەکاربێتن.

تەنها بەخوێندنەوەی ئەم ووشە تێدەگەی مەبەستی سەرەکی چیە ، (یەك ، ووشەی یەك زیاتر ناا) یەك خوا ئەپەرسترێ بەحەق شایستە بێت بۆ پەرستن ئەویش (الله) یە .

## جۆرەکانی تەوحید:

١ : تەوحیدی ڕبوبیەت (پەروەردگارێتی) : بریتییە لەوەی : الله عز وجل بە تاك و تەنها ڕابگری بەوەی کە تەنها خۆی دروستکەر و بەڕێوەبەر و مرێنەر و ژیێنەر و ڕزق و ڕۆزیدەرە ...هتد

فلا خالق إلا الله، كما قال تعالى: { اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ }. سورة الزمر آية : ٦٢.

ولا رازق إلا الله، كما قال تعالى: { وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا}. سورة هود آية : ٦.

ولا مدبِّر إلا الله، كما قال تعالى: { يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ }. سورة السجدة آية : ٥.

٢ : تەوحیدی ئولوهیەت (پەرستراوێتی) : بریتییە لەوەی الله عز وجل بە تاك و تەنها ڕابگریت لە هەموو پەرستشەکانت و تەنها ئەو بپەرستیت و تەواوی جۆری پەرستنەکان بۆ ئەو تەرخان بکەیت.

فلا ندعو إلا الله، كما قال تعالى: { وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ }. سورة غافر آية : ٦٠.

ولا نخاف إلا الله، كما قال تعالى: {فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ}. سورة آل عمران آية : ١٧٥.

ولا نتوكل إلا على الله، كما قال تعالى: {وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ}. سورة المائدة آية : ٢٣.

ولا نستعين إلا بالله، كما قال تعالى: { إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ }. سورة الفاتحة آية : ٥.

ولا نستعيذ إلا بالله، كما قال تعالى: { قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ }. سورة الناس آية : ١.

٣ : تەوحیدی ئەسماء و سیفات : بریتییە لەوەی الله عز وجل بە تاك ڕابگریت لەوەی کە تەنها خۆی خاوەنی ناو و سیفاتی جوان و تەواو و بەرز و بڵندە ، وە نابێت ناو و سیفاتەکانی پەك بخەیت یان بە عەقڵ و بۆچوونی خۆت لێکیان بدەیتەوە یان بیچوێنی بە دروستکراوەکانی ، ئەوەی لەسەرتە بریتییە لەوەی وەکو خۆی قبوڵی بکەی بەو شێوەی سەلەف وەریان گرتوە ، بەبەڵگەکانی قورئان و سوونەت جێگیر کراون.

قال تعالى : { لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ } [ الشورى: ١١ ].

## ناساندنی ئیسلام:

ئیسلام بریتییە : لەوەی کە تەسلیمی الله عز وجل بیت ، بە تاك و تەنهایی ، وە ملکەچ بیت بۆی بە عیبادەت مردن ، وە خۆت بەریئـ بکەیت لە کافران و کوفرەکانیشیان.

الله عز وجل دەفەرموویت : { وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ } [ البينة : ٥ ]

واتە : فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە الله بپەرستن و بە پاکی و دڵسۆزی ، لابدەن لە هەموو ئایینێك و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن ، نوێژیش بەرێك و پێکی ئەنجام بدەن ، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن ، ئەوەیە ئاینی ڕاست و بەنرخەکانی الله عز وجل.

★ لە ناساندنی ئیسلام بەڕائەت کردنە لە کوفر و ئەهلەکەی { قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ }[ الممتحنة : ٤ ]

واتە : بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون سەرمەشقێکی چاکتان بۆ هەیە ، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان ووت ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو

شتانەش کە لەجیاتی الله عز وجل دەیپەرستن ، ئێمە باوەڕمان بەو ئاینەی ئێوە نیە ، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە الله دەهێنن بە تاك و تەنها.

## چ دینێك قبوڵ کراوە لای الله ؟

الله عزوجل دەفەرموێ : { إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّـهِ الْإِسْلَامُ ۗ } بێگومان تەنها ئەم دینی ئیسلامەیە ، پەسەندو قبووڵە لای خوا ، چونکە پاڵافتەو پوختەی تەواوی ئایینە ئاسمانییەکانی ترە ، بۆیە لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: { وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ } واتە : هەرکەسێك بەهەر دینێکی ترەوە بەرەو خوا بچێت ، خوا لێی وەرناگرێ.

## پێناسەی موسڵمان و ئیماندار:

موسڵمان : هەرکەسێکە لە ڕووکەشدا ئیسلامەتی لێ ببنیرێ و ئەرکانەکانی ئیسلام جێ بەجێ بکات ، و هیچ کوفر و شیرکێکی لێ نەبینرابێت.

واتە : نوێژ بکا و ڕۆژوو بگرێ و لەسەر سوونتەت بێ و هیچ کوفر و گومڕاییەکی لێ نەبینرابێ.

ئیماندار : هەموو موسڵمانێکە کەوا بەتەواوەتی شوێن کەوتەیە و کەسێکی لەخواترس و خۆپارێزە و خاوەن تەقوایە.

## جیاوازی نێوان ( موسڵمان و ئیماندار):

هەموو ئیماندارێك موسڵمانە ، بەڵام هەموو موسڵمانێك ئیماندار نیە.

{ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمْۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَٰلِكُمْ شَيْـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ } [ الحُجُرات : ١٤ ].

## جیاوازیی نێوان ئیسلام و ئیمان:

{ قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّاۖ } عەرەبە دەشتەکییەکان وتیان : بڕوامان هێناوە بە خواو بە پەیامبەری خوا { قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا } بڵێ : نەخێر ، باوەڕتان نەهێناوە { وَلَٰكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا } بەڵام بڵێن : هەر لە ترسی کوشتن و دیل بوون موسڵمان و ملکەچ بووین ، بڕوا هێنان هەیە و خۆ بەدەستەوەدان هەیە ، ئەوەی ئێوە تەنها سەرزارییەو لە دڵدا ڕاست ناکەن ، هەر لەبەر ئەمەشە کە هەندێ لە زاناکان دەڵێن : ئیمان و ئیسلام دوو زاراوەی جیاوازن.. لە کاتێکی گرانیی و وشکەساڵیدا دەستەیەك لە عەرەبە دەوارنشینەکان هاتنە مەدینەو منەتیان سەر پەیامبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نا ، کە موسڵمان بوون ، وتیان : ئەی پەیامبەری خوا! بڕوامان هێناوە ، ئێمە وەك هۆزی فلان و فلان جەنگت لەگەڵ ناکەین ، بەڵێ.. لەو قسەو باسانەیان زۆر گوت ! ئەوجا ئەم ئایەتە: { قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا } هات .

بەڵێ.. ئایەتەکە بە ڕاشکاوی گەیاندی کە وشەو مانای بڕوا (ئیمان) گەلێ فراوانترو گەورە ترە لە ووشەو مانای ئیسلام.. چونکە باوەڕ (ئیمان) بە دڵ و بە زمان و بە کردەوە (إعْتِقَادٌ، وَقَوْلٌ، وَعَمَلٌ) دەبێت ، بەڵام ئیسلامبوون بە خۆ بە دەستەوەدان و ملکەچ بوونێکی ڕواڵەتیش دەبێ ، جا خوا هۆشیاری کردنەوە کە ئیمانی ڕاستەقینە دەبێ کردەوەش پشتگیری بکات. سەرنج : زانایان دەڵێن : (كُلُّ مُؤْمِنٍ مُسْلِم، وَلَيْسَ كُلُّ مُسْلِمٍ مُؤْمِن) ، واتە : هەموو باوەڕدارێك موسوڵمانە ، بەڵام مەرج نیە هەموو موسوڵمانێ باوەڕدار بێت. { وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ } وە هێشتا بڕوا نەچووەتە نێو دڵتانەوە { وَإِن تُطِيعُوا اللَّـهَ وَرَسُولَهُ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا } ئەگەر گوێرایەڵی خواو پەیامبەری خوابن ، ئەوا خواش هیچ شتێك لە پاداشتی کردەوەکانتان کەم ناکاتەوەو بە تێرو تەسەلی پاداشتتان ئەداتەوە { إِنَّ اللَّـهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ }.

## مونافیق کێیە ؟ :

باشترین پێناسە بۆی : پێشەوا ئەحمەد دەڵێ : دوو ڕوویی بریتیە لە : دەرخستنی ئیسلامەتی و شاردنەوەی کوفر.

واتە : کەسی مونافیق کافرە.

## کافر:

پێناسەیەکی گشتگیری هەیە و فراوانە ، کافر کەسێکە بڕوای بەخوا نیە ، یان کەسێکە بڕوای بە الله هەیە بەڵام بە پێغەمبەر نیە ، پێناسەی کافر گشتگیرە چونکە ، موشریك و موونافیق و مولحید.. هتد هەمووی دەگرێتەوە.

## موشریك:

کەسێکە یان موسڵمانێکە لەدین دەرچوە بەهۆی شیرکەوە ، هاوبەشی بۆ الله بڕیارداوە ، لە عیبادات و پەرستن.. هتد.

هەموو موشریکێك کافرە.

## ناساندنی کوفر و شیرك و جۆرەکانی:

لە پێشدا باسی کافر و موشریك و مونافیقمان کرد ، لێرەش دا باس لەو کارانە دەکەین کەوا کوفر و شیرکن.

**کوفر و شیرک دەکرێن بە دوو بەشەوە:**

١- کوفر و شیرکی گەورە.

٢ - کوفر و شیرکی بچووك.

الله تعالى دەفەرموویێت: { إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ ۖ } [ الزمر : ٧ ].

واتە : ئەگەر ئێوە کوفر ئەنجام بدەن ئەوا الله دەوڵەمەندە و پێویستی پێتان نییە وە بە هیچ شێوەیەك بە کوفر ڕازی نییە بۆ بەندەکانی.

وە پێغەمبەریش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویێت : ( **من مات يشرك بالله شيئا دخل النار** ).

واتە هەر کەس بمرێت شەریکی بۆ الله بڕیاردابێت دەچێتە ئاگرەوە. [ صحيح البخاري : ١٢٣٨ ].

## کوفری گەورە :

ئەم کوفرە ، خاوەنەکەی لە بازنەی دین دەرەخات ، کوفرێکی بیروباوەڕی و عەقیدەییە.

**جۆرەکانی:**

یەکەم : کوفری بە درۆخستنەوە و نکۆڵی کردن.

بریتییە لەوەی ئایەتێك یان فەرموودەیەکی صەحیح بە درۆ بخەیتەوە ، ئیتر بەهەر بیانوویەك بێت ، تەنانەت ئینکاری لە تاکە پیتێکی قورئان بکەی کافر دەبیتەوە.

بەبەڵگەی : { وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِلْكَافِرِينَ } [ العنكبوت : ٦٨ ].

وقوله تعالى: { أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ } [ البقرة : ٨٥].

یان ئەو حوکمەی کە لە ئایەت و فەرموودەکە هاتووە ئینکاری لێ بکەیت ، بڵێی وانییە بۆ نمونە پێنج پایەکەی ئیسلام لەسەر هەموو کەسێکی عاقڵ و باڵغ فەڕزە تۆ بێی بڵێی نەخێر فەڕز نییە ، جا ئەوە کوفری گەورەیە و پێی کافر دەبیتەوە.

الله تعالى دەفەرمووێت : { بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ } [ يونس : ٣٩ ].

واتە : نەخێر ، کە باوەڕیش ناهێنن هی ناتەواوی قورئان نیە بەڵکو بە درۆی دەزانن و لە مانا و مەبەستەکانی تێنەگەیشتوون:

دووەم : کوفری گاڵتە پێکردن و بەکەم زانین.

بریتییە لەوەی : گاڵتە بەو شتانە بکەیت کە الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمانیان پێ کردووە ، یاخود شتێکی خۆت یان کەسێکی ترت پێ باشتر بێت لەوەی کە ئەوان فەرمانیان پێ کردووە.

بۆ نمونە هەیە گاڵتە بە ڕیش و نیقاب دەكات ، یاخود حوكمەكانی الله تعالی وەكو دەست بڕینی دز ، جەڵد كردن و بەرد باران كردنی زیناكار بە كۆنەپەرستی و وەحشی گەری دەزانێت و ناوی لێ دەنێت پێچەوانەی مافی ئافرەت و مروڤن هتد....

{ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ (٦٥) لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ }. سورة التوبة آية : ٦٥ ، ٦٦.

واتە : ئەگەر لێیان بپرسیت دەڵێن هیچ نەبوو تەنیا گاڵتە و سوعبەتمان دەكرد ، بڵێ ئەوە گاڵتەتان بە الله و ئایەتەكانی و پێغەمبەرەكەی دەكرد ، هیچ عوزر مەهێننەوە تازە كافر بوون دوای ئەوەی ئیمانتان هێنابوو.

سێیەم : كوفری جنێودان و ڕق لێبوونەوە و بە سوك سەیركردن.

بریتییە لەوەی : كە كەسێك جنێو بدات بە الله ، یان پێغەمبەرەكانی ، یاخود كتێبەكانی ، و دینەكەی و بەسووك سەیركردنی.

چوارەم : كوفری تەككەبوور و پشت كردنە دینی الله.

وەكو كوفری ئیبلیس و فیرعەونە ، كە خۆیان بە گەورە زانی لە ئاست فەرمانی الله عز و جل ، هەروەها پشتییان كردە بەرنامەی الله.

الله تعالى دەفەرموویت : { وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ } [ البقرة : ٣٤ ].

کاتێك بە فریشتەکانمان فەرموو سوجدە ببەن بۆ ئادەم ، هەموویان سوجدەیان برد تەنها ئیبلیس نەبێت کە گوێی پێ نەدا و خۆی بە گەورە زانی و لە کافران بوو.

الله دەربارەی فیرعەون دەفەرموویت : { فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ } [ الذاريات : ٣٩ ].

واتە : فیرعەونیش ڕووی وەرگێڕا و سەرپێچی کرد بەهۆی دەسەڵاتەکەیەوە وە وتی : (مووسا) جادووگەرە یان شێتە.

پێنجەم : کوفری گومان و دووڕوویی.

بریتییە لەوەی : کە گومانت هەبێت لە ڕاستی و دروستی ئەوەی الله تەعالا ناردوویەتیە خوارەوە ، جا بە ڕووکەش وا نیشان دەدەیت کە قەناعەتت پێی هەیە بەڵام لێی بە گومانی و لە ناخەوە قەناعەتت پێی نییە.

الله تعالى دەفەرموویت : { وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا (٣٥) وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ

خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا (٣٦) قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا }. سورة الكهف آية : ٣٥ ، ٣٦ ، ٣٧.

واتە : بە نێو باخەکەیدا گەڕا و ستەمی لە خۆی کرد و وتی هەرگیز باوەڕناکەم ئەمەم لەدەست دەربچێت ، باوەڕناکەم ڕۆژی دوایی بێت و ڕوو بدات ، خۆ ئەگەر (پاش مردن) بمگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم هەڵبەت باشتر لەمەم دەست دەکەوێت ، هاوەڵە ئیماندارەکەی لە کاتێکدا کە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد پێی وت : ئەوە باوەڕت نەماوە بەو زاتەی کە سەرەتا تۆی لە خاك دروست کردووە؟! لەوەودوا نوتفەیەك بوویت ، پاشان کردیتی بە پیاوێك.!!

وە دەفەرموێت : { إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا }. سورة النساء آية : ١٤٥.

واتە : بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خوارەوەی ناو دۆزەخدان و هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانێکت دەست ناکەوێت.

شەشەم : کوفری وازهێنان لە عیبادەتکردن.

بریتییە : لەوەی وازبهێنیت لە پەرستنی الله تعالی ، واتە ئەو شتانەی لەسەرت فەرزە نەیانکەیت ، ئەگەر چی بە فەرزیشی بزانیت بەڵام نەیکەیت پێی کافر دەبیت وەکو نوێژ.

الله تعالى دەفەرموویت : { مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ }. سورة الروم آية : ٣١.

واتە : بگەڕێنەوە بۆ لای و لێی بترسن و نوێژ بکەن و لە ڕیزەی ئەوانە مەبن شەریکی بۆ پەیدا دەکەن.

الله دەفەرموویت : { فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ }. سورة التوبة آية : ١١.

واتە : ئەگەر تۆبەیان کرد و نوێژیان کرد و زەکاتیان دا ئەوا ئەو کات براتانن لە ديندا بەم شێوازە ئایەتەکانی خۆمان ڕوون ئەکەینەوە درێژەی پێ ئەدەین بۆ کەسانێك کە زانیاریان هەبێت.

هەروەها پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت : ( **إن بين الرجل و بين الشرك و الكفر ترك الصلاة** ). صحيح مسلم : ٨٢.

واتە : نێوان پیاو و شیرك و كوفر بریتییە لە وازهێنان لە نوێژ.

حەوتەم : من لم يكفر الكافر فهو كافر.

واتە هەر کەس کافر بە کافر نەزانێت ئەوا خۆی کافرە.

واتاکەی ئەوەیە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا دەردەکەوێت کافرە بەڵام تۆ بێیت بڵێی من بە کافری نازانم ، ئەگەر وات وت ئەوا خۆت کافر دەبیتەوە ، بۆ نمونە هەندێ دەڵێن : ناتوانین نەسرانی و جولەکە بە کافر بزانین!

لە کاتێکدا الله بەکافری داناون الله تعالی دەفەرمووێت : { لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ ۘ }. سورة المائدة آية : ٧٣.

واتە : ئەوانە کافربوون کە وتیان الله یەکێکە لە سێ خواکە (واتە نەسرانیەکان).

دەفەرمووێت : { إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ أُولَٰئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ }. البينة آية : ٦.

واتە : ئەوانەی کە کافر بوون لە ئەهلی کتاب و ئەوانەش کە شەریکیان بۆ الله بڕیاردا ئەوا لە ئاگری جەهەننەم دەمێننەوە بە هەتا هەتایی وە ئەوانە خراپترینی دروستکراوەکانن:

★ هەر کەس کوفر بکا با پێشتریش وتبێتی(لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه) ، کافر دەبێتەوە ، چونکە کوفر و ئیمانیش کۆنابنەوە لە دڵێکدا ، تۆش بە کافری دابنێت و بۆ ئەوەی کە خۆت کافر نەبیتەوە.

هەشتەم : کوفری جێگیر نەکردنی ناو و سیفاتەکانی الله تەعالا.

بریتییە لەوەی : کە ئەو ناو و سیفاتانەی کە الله تەعالا لە قورئان جێگیری کردووە یاخود لە فەرموودەی صحیح پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و ئاثاری هاوەڵان رضي الله عنهم بۆیان جێگیر کردووە تۆ بێیت جێگیری نەکەیت بۆی.

★ لای ئەهلی سوننە جێگیرکردنی سیفاتی الله بریتییە لەوەی کە وەکو خۆی لەسەر ڕووکەش بەبێ گۆڕینی ماناکەی (تحریف و تأویلی گروپە گومڕاکان) و بێ ئەوەی بشڵێن نازانین مانای سیفەتەکە چییە (تفویض) جێگیری دەکەن ، وە هەروەها ناشڵێن ئەو سیفەتە چۆنە و چۆن نییە ، چونکە چۆنێتییەکەی تەنها الله دەیزانێت ، هەروەها سیفاتەکان بە هیچ شێوەیەك ناشوبهێنن بە سیفەتی مەخلوقەکانی الله تعالی ، چونکە هیچ شتێك لە الله ناچێت ، ئەو گروپانەی کە کەوتوونەتە ناو ئەم کوفرەوە ڕاستەوخۆ ناوێرن بڵێن جێگیری ناکەین بەڵکو دێن لێکدانەوەیەکی بۆ دەکەن و ماناکەی دەگۆڕن.

بۆ نمونە الله تعالی دەفەرموێت : { قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ } [ ص : ٧٥ ].

فەرمووی : ئەی ئیبلیس چی وای لێ کردیت سوجدە نەبەیت بۆ ئەوەی کە بە دوو دەستی خۆم دروستم کردووە .

لێرە و لە چەند ئایەتی دیکە الله سیفاتی دوو دەست بۆ خۆی جێگیر دەکات ، ئەهلی سوننە وەکو خۆی بۆی جێگیر دەکەن بە بێ ئەوەی چۆنێتییەکەی بزانن ،

چونکە دەستی الله تعالی لە هی دروستکراوەکانی ناچێت و بەس خۆی دەزانێت دەستی چۆنە ، بەڵام گروپە گومڕاکان ناوێرن بە ئاشکرا بڵێن دەستی نییە بەڵکو دەڵێن دەست لێرە مەبەستی دوو نیعمەتە.!

بابەتی ئەسمائو سیفات ، زۆر هەستیارە هاوشێوەی جۆرەکانی تری تەوحید ، بەتایبەت بابەتی بەرزی و بڵندی و چوونە سەر عەرش و جێگیر کردنی شوێن بۆ الله عزوجل.

**کوفری بچووك:**

کوفری بچووك : ئەو تاوانەیە کەوا ئەنجامدەرەکەی لەبازنەی ئیسلامەتی دەرناکات ، (پێی کافر نابێ) ، ئەمەش پێی دەڵێن:

(كفر دون كفر) (فسق دون فسق) .

پێشەوا **ئەحمەد** لە ئوسوڵی سوننە دا بۆمان شیدەکاتەوە و دەڵێت:

والنفاق هُوَ الْكفْر أَن يكفر بِاللَّه ويعبد غَيره وَيظْهر الْإِسْلَام فِي الْعَلَانِيَة مثل الْمُنَافِقين الَّذين كَانُوا على عهد رَسُول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (**ثَلَاث من كن فِيهِ فَهُوَ مُنَافِق**) على التَّغْلِيظ نرويها كَمَا جَاءَت وَلَا نقيسها وَقَوله (**لَا ترجعوا بعدِي كفَّارًا ضلالا يضْرب بَعْضكُم رِقَاب بعض**) وَمثل(**إِذا التقى المسلمان بسيفهما فالقاتل والمقتول فِي النَّار**) وَمثل (**سباب الْمُسلم فسوق وقتاله كفر**)

وَمثل (من قَالَ لِأَخِيهِ يَا كَافِر فقد بَاء بهَا أَحدهمَا) وَمثل (كفر بِاللَّه تبرؤ من نسب وَإِن دق) وَنَحْو هَذِه الْأَحَادِيث مِمَّا قد صَحَّ وَحفظ فَإنَّا نسلم لَهُ وَإِن لم نعلم تَفْسِيرهَا وَلَا نتكلم فِيهَا وَلَا نجادل فِيهَا وَلَا نفسر هَذِه الْأَحَادِيث إِلَّا مثل مَا جَاءَت لَا نردها إِلَّا بِأَحَق.

واتە : دوو ڕوویی ( نیفاق ) بریتیە لە کوفر ، کە کوفر بە الله بکەیت و بەندایەتی جگە لەو بکەی وە ئیسلامەتی خۆی لە ئاشکرا بەدیار دەخات وەکو منافیقەکانی سەردەمی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی:

١ : (سێ شت هەن لەهەر کەسێک دا بێت دوو ڕووە ) ئەمەش لەسەر توێند بوون دەیگێڕینەوە وەك هاتووە تەفسیری بۆ ناکەین.

٢ : وە فەرموودەی :(دوای من گومڕاو کافر نەبنەوە هەندێکتان لەگەردەنی هەندێکی ترتان بدەن).

٣ : فەرموودەی (گەر دوو موسڵمان بە شمشێر ڕووبەڕووی یەك بنەوە بکوژ و کوژراو بۆ ئاگرە).

٤ : وە فەرموودەی (جوێندان بە موسڵمان فیسقە و شەڕکردنیشی کوفرە).

٥ : وە فەرموودی (هەریەک بەبرای بڵێ ئەی کافر ئەوا ئیللا بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە).

٦ : وە فەرموودەی (کوفر بە اللە بێ بەشت دەکات لە لە نەسەب گەر کەمیش بێ).

هاوشێوەی ئەو فەرموودانەی کەوا بە سەحیحي هاتووە لەبەرمان کردووە ئێمە تەسلیمی دەبین گەربێت تەفسیریشی نەزانین و قسەشی لەسەر ناکەین و موناقەشەی تێدا ناکەین ، ئەو فەرموودانە لێکنادەینەوە و تەفسیر ناکەین تەنیا بەو شێوە.

ئەم باسەش ووردەکاری زۆری تێدایە بەڵام بۆ ئەم قۆناغە تەواوە تاخوێنەر لێی تێکەڵ نەبێ.

## شیرکی گەورە :

شیرك واتە : (هاوبەش بڕیاردان بۆ اللە تەعالا ) بە گشتی بریتییە لە : ئەنجامدانی هەر جۆرە پەرستنێك لە پەرستنەکان بۆ غەیری اللە عز وجل ، پەرستن بە تەنها سوجدە بۆ بردن و تەواف کردن نییە ، بەڵکو چەندین جۆری تریشی هەیە.

١ : شیرکی داواکردن و هاوار لێکردن.

بریتییە لەوەی هاوار لە غەیری اللە عز وجل بکەیت ، بۆ شتێك کە تەنها اللە عز وجل خاوەنیەتی ، وا بزانیت گوێی لێتە یاخود بە هاناتەوە دێت ، جا ئەو کەسە یان ئەو شتەی بانگی دەکەیت لە غەیری اللە عز وجل یان ئەوەتا کەسێکی

مردووە لە پێغەمبەران علیهم السلام و پیاوچاکان ، یان قەبرێکە یان بتێکە یاخود کەسێکە کە غائبە و لە نزیکت نییە و دەنگت نایگاتێ.

الله تەعالا لە بارەی موشریکەکانی قوڕەیشەوە دەفەرمووێت : { مَا نَعْبُدُهُمْ إِلا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى } [ الزمر : ٣ ].

واتە : ئێمە نایان پەرستین مەگەر بۆ ئەوە نەبێت کە لە الله نزیکمان بکەنەوە.

★ ئایا تۆ پێت وایە عیبادەتی کافرەکانی قوڕەیش بۆ بت و پیاوچاکەکانیان چۆن بووە ؟ لە وەڵامدا دەڵێم الله تعالی دەفەرمووێت : { فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ } [ العنكبوت : ٦٥].

واتە : ئەوان ئەگەر سواری کەشتی بووبان بە تاك و تەنها و نییەت پاکییەوە داوایان لە الله عز وجل دەکرد و بەس هاواریان لەو دەکرد ، بەڵام کاتێك الله ڕزگاری دەکردن و دەگەیشتنە وشکانی ، ئەوا یەکسەر دەستیان دەکرد بە شەریك دانان بۆی.

٢ : شیرکی گوێڕایەڵی کردنی کەسێک لە حەڵالکردنی شتێک کە الله تەعالا حەرامی کردووە ، یاخود لە حەرام کردنی شتێک کە الله تەعالا حەڵاڵی کردووە ئەمەش بەو شێوەیە دەبێت کە شتێك الله تعالی حەڕامی کردووە کەسێك دێت حەڵاڵی دەکات ، تۆش شوێنی دەکەویت و حەڵاڵی دەکەیت ئەمە دەبێتە شیرکی

گوێڕایەڵی ، وە بە پێچەوانەشەوە شتێك الله تعالى حەڵاڵی کردووە کەسێك دێت حەڕامی دەکات تۆش شوێنی دەکەویت و حەڕامی دەکەی دووبارە بەمەش موشریك دەبیت ، وە ئەو کەسەش کە حەڵاڵ و حەڕام دادەنێت و حساب بۆ الله ناکات ئەویش کافرە لەبەر ئەوەی بڕیاردان لەسەر حەڕام و حەڵاڵ تایبەتە بە پەروەردگارییەتی الله ـوە و لەوەدا هاوبەشی نییە.

الله تعالى دەفەرمووێت : { اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ } [ التوبة : ٣١ ].

واتە : گاور و جولەکە حاخام و قەشەکانی خۆیان کردە خوا لە غەیری الله ، وە عیسای کوڕی مەریەمیشیان کردبووە خوا کەچی تەنیا فەرمانیان پێ کرابوو یەك خوا بپەرستن کە الله ـیە.

**ابن جەریری تەبەڕی** لە تەفسیرەکەیدا لە بارەی ئەم ئایەتەوە لە هاوەڵی بەڕێز عدي کوڕی حاتم ـەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە:

هاتم بۆ لای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و خاچێکم لە ملدا بوو ، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێی فەرمووم : ئەی عەدی ئەو پەیکەرە لە ملت دابکەنە ، عەدی فەرمووی : منیش لە ملم دام کەند و دواتر پێغەمبەر.صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەم ئایەتەی خوێندەوە (مەبەست لە ئایەتەکەی سەرەوەیە)

منیش وتم : ئەی پێغەمبەری الله ئێمە حاخام و قەشەكانمان نەدەپەرست ، فەرمووی : ئەی ئەوەیان بۆ حەڕام نەدەكردن كە الله حەڵاڵی كردبوو ئێوەش حەڕامتان دەكرد؟! وە ئەوەیان حەڵاڵ دەكرد كە الله حەڕامی كردبوو ئێوەش حەڵاڵتان دەكرد؟

وتم : بەڵێ.

فەرمووی : جا ئەوە پەرستنیانە.

٣ : شیركی خۆشویستن.

الله تعالى دەفەرمووێت : { وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ } [ البقرة : ١٦٥ ].

واتە : هەندێك لە خەڵكی هاوبەش و هاوتا بۆ الله بڕیار دەدەن و خۆشیان دەوێن وەكو خۆشویستنی الله ، بەڵام ئیمانداران الله ـیان زیاتر خۆش دەوێت وەك لە خۆشویستنی ئەم موشریكانە بۆ پەرستراوەكانیان.

**ابن جرير** هێناویەتی لە تەفسیرـی ئەو ئایەتە ئەڵێ:

هەندێك پێیان وایە [ أنداد ] لەو شوێنەیە ئەوە گەورەو سەركردەكانیانە كەوا گوێڕایەڵیان ئەكەن و ملكەچیان ئەبن بۆ سەرپێچی كردنی الله تعالى.

هێناویەتی لە **السدي** ئەڵێ : أنداد ، لەپیاوان ، گوێڕایەڵیان ئەبن وەکو چۆن گوێڕایەڵی الله ئەبن ، گەر بێت و فەرمانیان پێکردن گوێڕایەڵیان ئەبن و سەرپێچی الله ئەکەن.

ئەڵێم : مەبەست لێرەدا گوێ ڕایەڵیە لەسەر بنەمای سەرپێچیکردنی فەرمانی الله عزوجل ، ئینجا ئەڵێ : { كَحُبِّ اللَّهِ }.

ئیمامی **تەبەڕی** ئەڵێ : مانای وشە ئەوەیە : لەنێو خەڵکیدا ، کەسانێک هەن (أنداد) یان وا خۆش دەوێ وەکو خۆشویستنی ئێوە ئەی ئیمانداران بۆ الله تاعالا .

٤ : سەربڕین بۆ غەیری الله تەعالا.

بریتییە لەوەی کەسێك حەیوانێك سەربېڕێت بۆ رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، بۆ شێخێك ، یاخود بۆ قەبر و مەرقەد ، یان سەرۆکێك ، لە دڵی خۆیدا نیەتەکەی وابێت یان لە کاتی سەربڕیندا ناوی الله و ناوی کەسێکی تری لێ دەهێنێت ، یان تەنها ناوی ئەو کەسە ئەهێنێت کە لە غەیری الله تعالی بۆی سەرئەبڕێت ، جا ئەنجامدانی ئەوانە شیرکە و حەیوانەکەش گۆشتەکەی حەرام دەبێت.

الله عز وجل دەفەرمووێت : { قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ } [ الأنعام : ١٦٢ ].

واته : ئەی محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێیان بڵێ نوێژ کردن و حەیوان سەربڕین و ژیان و مردنم بە تەنها بۆ الله ـیە کە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

**شیرکی بچووك:**

ئەم جۆرە تاوانە خاوەنەکەی لەدین دەرناکات ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکە لە گەورەترین تاوانەکان ، ترسناکیشە چونکە هەنگاوێکی گەورەیە بەرەو شیرکی گەورە.

بۆنمونە : ڕیا و ڕووپامایی و هتد...

**ناساندنێك بۆ ( طاغوت ):**

طاغوت : زۆرینەی ئەهلی عیلم یەك دەنگن لەسەر ئەوەی (طاغوت) هەرشتێکە بپەرسترێ جگە لە الله ، (پێی ڕازیبێ) نموونەی فیرعەون و نەمرود و زۆرێکی تری دوای ئەوان و بەو سەردەمەی ئێستاوەش.

تاغوت : بەمانای سنوربەزاندن دێ ، لەئاستێکەوە بۆ ئاستێکی تر ، بۆنموونە : لە بەندایەتی بۆ پەرستش ، یان سنور بەزاندن لە ستەم و زۆرداری و چەوسانەوە.

★ پێشەوا **ئیبن جەریر تەبەڕی** دەڵێ : ئەهلی عیلم ناکۆکن لە ووشەی تاغوت هەندێکی دەڵێن : واتا (شەیتان) ئەوانیش:

١ : پێشەوا **عومەری کوڕی خەتتاب** دەڵێ : واتە شەیتان.

٢ : پێشەوا **موجاهید** دەڵێ : واتە شەیتان.

٣ : پێشەوا **شەعەبی** دەڵێ : واتە شەیتان.

٤ : پێشەوا **ضەححاك** دەڵێ : واتە شەیتان.

٥ : پێشەوا **قەتادە** دەڵێ : واتە شەیتان.

٦ : پێشەوا **السدی** دەڵێ : واتە شەیتان.

★ پێشەوا **تەبەڕی** دەڵێ : هەندێک پێیان وایە ساحیرە.

١ : **ئەبو العالیه** دەڵێ : تاغوت واتە : ساحیر.

٢ : **موحەممەدی کوڕی سیرین** دەڵێ : واتە ساحیر.

★ هەندێکیش پێیاوان وایە تاغوت واتە کاهین.

وەکو : پێشەوا **سەعیدی کوڕی جوبەیر** و **ڕەفیع**.

★ پێشەوا **تەبەڕی** دەڵێ : سەواب لای من بۆ مانای تاغوت هەموو کەسێکی سنور بەزێنە لەسەر الله عزوجل ، ئینجا پەرستش بێ یان بەندایەتی ، ئینجا مرۆڤە ، شەیتانە ، بت ، سەنەم و کاهینە.

## **مانای ( الكفر بالطاغوت ) چیە ؟:**

الله عزوجل دەفەرموێ : { فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ }.

واتە : بەڕائەت دەكەی لە هەموو پەرستراوێك جگە لە الله ، وە پێی كافر دەبی ئینجا هەر شتێك بێ لەوانەی سەرەوە باسمان كرد ، وە باوەڕهێنان بەوەی تاكە پەرستراوی بەحەق الله عزوجل ــە.

پێشەوا **تەبەڕی** دەڵێ : بەڕائەتی هەموو پەرستراوێك بكا جگە لە الله ، وە الله بەڕاست دابنێ بەوەی تاكە ئیلاهـ و پەرستراوی ئەوە.

هەریەك لە ئیمامی **تەبەڕی** ، هەروەها **بەغەوی** و قورتوبی و **ئیبن كەسییر** دەڵێن : { وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ } واتە دووركەتنەوە لەهەرشتێک جگە لە الله بپەرسترێت ، وەك شەیتان و مرۆڤ و ( صنم ) بت ، كۆتاییان پێهێنا.

هەموو ئوممەتێك لەڕێگای پێغەمبەران ئاگادار كراونەتەوە لە دووركەوتنەوە لە تــاغووت.

بە بەڵگەی : قال الله تعالى في كتاب الكريم : { وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ } [ النحل : ٣٦ ].

★ شەیتان تاغووتە ، هەركەسێك بپەرسترێ و پێی ڕازی بێ تاغووتە ، هەركەسێك بانگەوازی بەندایەتی كردن و پەرستن بۆ خۆی بكات تاغووتە ،

هەركەسێك بانگەوازـی شتێكی غەیبی بكات تاغوتە ، هەندێك دەڵێن : ساحیریش تاغووتە.

والحمدلله رب العالمین كۆتایی قۆناغی چووارەم.



# کۆدەنگی ئەهلی سوننە دەربارەی بیروباوە

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ .... أما بعد:

بێگومان بیروباوەڕ : واتە (عقيدة) ، مەنهەج ، پێش هەموو زانستەکانی ترە ، ناسین و زانین و شارەزابوون لەمەنهەج و بیروباوەڕ ، هەتا لەپێش حفظ ـی قورئانە ، لەپێش حفظی(حديث)ـە لەپێش( حفظ )ـی ئەسەر و فیقهـیشە ، لەبەر ئەوەی قبوڵبوونی حفظ ـی(قورئان و حەدیث و فیقهـ و عیبادەت و هەموو شتەکان) پەیوەستە بەوەی کە تۆ مەنهەجێکی پاك و ڕاست و دروستت هەبێت .

★ ئەگەر بێت و خاوەن مەنهەجێك و بیروباوەڕێکی پاك و ڕاست و دروست نەبی ، (مەنهەجێك) نەبێ کەوا لەسەر مەنهەجی حەقیقی ، وە ڕاست و دروستی ئەهلی سوننە و جەماعە بێ ، بێگومان کردەوەکانت { وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا } وای لێدێت ، لەبەر ئەوەی وەرناگیرێتن ، واتە وەکو چۆن مەرجی قبوڵ بوونی(نوێژ) (دەست نوێژە) ، بەهەمان شێوە مەرجی قبوڵ بوونی کردەوەکان و عیبادەت و نوێژ و ڕۆژو و ئەوانی تر. (بوونی)

عەقیدەیەکی ڕاست و دروستە ، لەسەر قورئان و سوننەت بەفەهمی سەلەفی ئوممەت.

ئێمەش بەیارمەتی الله عزوجل هەوڵمانداوە ، کۆدەنگیەکی (پووخت) لە بیروباوەڕ و مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە بۆ فێرخوازی زانستی شەرعی بخەینە ڕوو ، تاوەکو بەشێوەیەکی پووخت و ئاسان لەمەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە وە لەمەنهەجی(خیرالقرون)و سەلەفی ئوممەت تێبگاتن.

شێوازی داڕشتنی ئەم کۆدەنگییە بۆ ئەوەیە هەم خۆت بەشێوەیەکی پووخت و ئاسان تێبگەی وە هەروەها هەمیش بەرامبەر تێبگەینی.

بۆنموونە : کاتێك قسە بۆ کەسێك دەکەیت کە دەتەوێت شارەزای مەنهەجی سەلەفی بکەیت ، یاخود ڕووبەڕوو ، چونکە پێویستە بیروباوەڕ (حفظ) بکرێت ، واتە : ئەولاترە لەپێش زانستەکانی تر کەوا (حفظ) بکرێتن ، تۆ گەر بتەوێت کەسێك تێبگەینی ، ناکرێ تۆ هەموو کات لەسەر فەیسبووك نیت یاخود لەسەر ئەنتەرنێت نیت تاوەکو نەسخی بکەیت ، بەڵکو عیلم ئەو عیلمەیە کەوا لە حفظ ـی سینگ بێتن لەنێو دڵ دابێتن ، ئینجا ڕاستەوخۆ بەرامبەر تێدەگەیەنی ، وە هەروەها بڕواپێکەر تریشە بۆ بەرامبەر ، ئەم کۆدەنگییە بەو شێوەیە:

ئەم کۆدەنگییە لە(اصول السنة) للإمام أحمد بن حنبل ، وە (أُصول السنة للحميدي) ، (عقيدة الرازيين) کەوا(ابن أبي حاتم الرازي) لە (أبو حاتم الرازي)

هەروەها (أبو زرعة الرازي) نەقڵی کردووە. وە لە(شرح السنة المزني) ، وە لە (شرح السنة البربهاري) ، وە (اصول السنة ابن أبي زمنين) هاتووە ، هەروەها ئەمە(اعتقادي إمام مالك) ـە ، کە لە بیروباوەڕەکەی هاتووە ، هەروەها (اعتقادي سفيان الثوري) کە بۆ (شعيب بن حرب) باسدەکاتن ، وە هەروەها(ابن المبارك) و زۆرینەی زۆری پێشەوایانی ئوممەتە بەم شێوەیە:

## کۆدەنگی ئەهلی سوننە دەربارەی ئیمان و قورئان

١ : ئەهلی سوننە دەڵێن : ئیمان وتە و کردارە ، زیاد و کەم دەکات ، زیاد دەکاتن بەگوێ ڕایەڵیێ و کەمیش دەکاتن بەسەرپێچی کردن.

ئەهلی بیدەع : لە پێناسەی ئیمان پێچەوانەن وەکو (موڕجیئە و جەهمیەکان).

٢ : ئەهلی سوننە دەڵێن : قورئان ووتەی(اللّٰه)یە و دروست کراو نییە.

ئەهلی بیدەع دەڵێن : قورئان دروست کراوە وەکو (جەهمیەکان) هەندێ لەئەشاعیرەش بەڵام بەشێوەی ناڕاستەوخۆ.



## کۆدەنگی ئەهلی سوننە دەربارەی قەدەر

٣ : ئەهلی سوننە دەڵێن : قەدەر هەمووی بە باش و خەراپییەوە لەلایەن الله تەعالا وەیە.

ئەهلی بیدەع وەکو قەدەریەکان پێچەوانەی ئەهلی سوننەن لەبڕوابوون بەقەدەرەوە.



## کۆدەنگی ئەهلی سوننە دەربارەی هاوەڵان

٤ : ئەهلی سوننە دەڵێن : باشترین کەسی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ، ئەبوبەکرە ئینجا عومەری کوڕی خەتتاب ، ئینجا عوسمانی کوڕی عەففان ئینجا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ، الله لێیان ڕازی بێت.

ئەهلی بیدعە وەکو ڕافیزە پێچەوانەی ئەهلی سوننەن.

٥ : ئەهلی سوننە دەڵێن : ڕەحمەت دەنێرین بۆ هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، ئینجا دەست گرتنەوە و بێدەنگ بوون لەو کێشە و فیتنانەی لەنێوانیاندا ڕوویداوە.

ئەهلی بیدعە : پێچەوانەی ئەهلی سوننەن ، جیاوازی دەکەن لەنێوانیان و بەتایبەت سۆفی و ڕافیزە ، بەتایبەتتر جنێودان و سووکایەتی بە هاوەڵی بەڕێز (معاوية بن أبي سفيان).



## كۆدەنگی ئەهلی سوننە دەربارەی ئەسمائو سیفات

## عەرش و بینین و دابەزینی الله

٦ : ئەهلی سوننە دەڵێن : ﷲ عزوجل لەسەر عەرشەكەیەتی ، وە جیایە لە دروستکراوەكانی ، بڕوامان پێی هەیە بەو شێوەی خۆی وەسفی كردووە لە قورئاندا و لە فەرموودە سەحیحەكاندا.

ئەهلی بیدەع و فیرەقی گومڕا دەڵێن : نەخێر الله لەسەر عەرش نیە ، زاڵ بووە بەسەری و دەستی بەسەردا گرتوە ، دەڵێن : هەریەك پێی وابێ الله لەسەر عەرشە لەدین دەرچێ ، وەكو ئەشاعیرەكان و جەهمیەكان.

٧ : ئەهلی سوننە دەڵێن : الله لەسەر عەرشەو زانست و زانیاری لەهەموو شوێنێكە.

ئەهلی بیدەع هەندێكیان دەڵێن : الله بەزاتی خۆی لەهەموو شوێنە. هەندێكیان دەڵێن : شوێن بۆ الله بڕیار نادرێ و خۆی دروستكەری شوێنە ، واتە : ئەوان خوایەك دەپەرستن دیار نیە.

٨ : ئەهلی سوننە دەڵێن : هەموو شەوێك الله عزوجل دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا بەو شێوەی شایستەی خۆی بێتن.

فیرەقی گومڕا دەڵێن : گەر دابەزێ شوێنەکەی چۆڵ دەبێ ، وەکو گاڵتەکردن بە عەقیدەی ئەهلی سوننە ، بێ ئاگان لەوەی الله توانای زاڵە بەسەر هەموو شت و چی بوێ ئەوە دەکاتن و چۆنیش بیەوێ وادەکات ، لەوانیش ئەشاعیرە.

٩ : ئەهلی سوننە دەڵێن : اللهُ تەعالا لە قیامەت دەبینرێت ، ئیمانداران الله دەبینن بە چاوەکانیان.

ئەهلی بیدەع و فیرەقی گومڕا : ڕەتی بینینی الله لە قیامەتیش دەکەنەوە .

★ (پێویستە بزانرێ ڕەتکردنەوەی ئەم باسانە لەدین دەرخەرن).

ئەهلی سوننە : ئیسپاتی ناوەجوانەکان و سیفاتە بەرزەکانی الله دەکەن بەو جۆرەی هاتوە بەبێ لێکچواندن و نمونە هێنانەوەو چۆنیەتی.

ئەهلی بیدەع و فیرەقی گومڕا دەڵێن : واتە ناو و سیفاتەکان پەك دەخەن و تەئویلی دەکەن ، ئەوانە لەسەرەتا الله دەشوبهێنن بە دروستکراو ئینجا پەکی دەخەن ئەمەش لەدین دەرخەرە.

بۆنمونە : پێیەکان و دەست و بینین و هاوشێوەی ئەمانە کە جێگیر بوە بەسەحیحی ئەوان پەکی دەخەن و دەیکەنە قودرەت و توانا.

کۆ دەنگی ئەهلی سوننە دەربارەی باسەکانی قیامەت بەهەشت و جەهەننەم و شەفاعەت و گۆڕو تەرازو حەوز.

١٠ : ئەهلی سوننە دەڵێن : بەهەشت و دۆزەخ هەردووکیان ڕاست و حەقن ، هەردووکیان دروستکراون ، بەجۆرێك دروست کراون کۆتاییان نایەت ، بەهەشت پاداشتی الله یە بۆ بەندە چاکەکانی جەهەننەم سزای الله یە بۆ ئەوانەی سەرپێچی کارو سنوربەزێنن.

★ هەندێك دەڵێن : دروستنەکراون ، هەندێکیش دەڵێن : کۆتاییان دێ. بەڵام ئەوەی باسمان کرد کۆدەنگی ئەهلی سوننەیە.

١١ : ئەهلی سوننە دەڵێن : پردی سیڕات ڕاستەو حەقە و بڕوامان پێی هەیە بۆ پەڕینەوە.

١٢ : ئەهلی سوننە دەڵێن : تەرازووی پێوانی کردەوەکان حەقە و ڕاستە و بڕوامان پێی هەیە ، چاکە و خەراپیەکانی بەندەی پێ دەکێشرێت.

١٣ : ئەهلی سوننە دەڵێن : حەوزی کەوسەر حەقە و ڕاستە کە دراوەتە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

١٤ : ئەهلی سوننە دەڵێن : شەفاعەت حەقە و ڕاستە ، بۆ دەرهێنان و ڕزگاربوونی موسڵمانی تاوانبارە کە پێیان دەڵێن : (موحید) شەفاعەت بەهیچ جۆرێ کەسێکی کافر یان موشریك ناگرێتەوە .

١٥ : ئەهلی سوننە دەڵێن : سزای نێو گۆڕ حەقە و ڕاستەو بڕوامان پێی هەیە .

هەندێ لەگومڕایان دەڵێن : سزای نێو گۆڕ بەهیچ جۆرێ نیە ئەمەش پێچەوانەی کۆدەنگی سەلەف و فەرموودەکانی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

١٦ : ئەهلی سوونە دەڵێن : مونکەر و نەکیر دوو فریشتەن لەنێو ناو گۆڕدا حەقە و ڕاستە بڕوامان پێی هەیە.

١٧ : ئەهلی سوونە دەڵێن : زیندوبوونەوە لەدوای مردن حەقە و ڕاستە بڕوامان پێی هەیە.

بێ بڕوایان : پێیان وایە کەوا زیندوو بوونەوە نیە و مردن کۆتایی هەموو شتێکە.



# کۆدەنگی ئەهلی سوننە دەربارەی ئەهلی قیبلەی تاوانبار

١٨ : ئەهلی سوننە دەڵێن : ئەنجامدەری تاوانە گەورەکان تەکفیر ناکەین بەهۆی ئەو تاوانەوە واتە : (ئەهلی قیبلە).

ئەهلی بیدەع وەکو خەواریج : تەکفیری ئەنجامدەری تاوانی گەورە دەکەن و لە ئیسلام دەری دەکەن.

١٩ : ئەهلی سوننە دەڵێن : جیهاد و تێکۆشان بەردەوام دەبێ و دەمێنێ لەگەڵ پێشەوای بڕواداران تاقیامەت ، پێدانی زەکاتیش پێیان ، ئەنجامدانی حەجیش لەگەڵیان.

٢٠ : ئەهلی سوننە دەڵێن : گوێ ڕایەڵ و گوێگری پێشەوای باوەڕدارانین ، لێیان دەرناچین ، شەڕیش ناکەین لەکاتی فیتنەدا. (پێشەوایەکی ئەهلی سوننەی لەسەر سوننەت).

ئەهلی بیدەع وەکو خەواریج : زۆر توندن لەسەریان و خروج لە بچوکترین دەرفەت بەهەل دەزانن.

مورجیئەش : زۆر شل و دوورن لە سوننەت بەرامبەریان ، بەجۆرێ کۆیلەیانن.

٢١: ئەهلی سوننە : پێیان وایە دابڕان و دوربون لە کۆمەڵی موسڵمانان ڕێگە پێدراونیە و دووره لە سوننەت. (موسڵمانی ئەهلی سوننە).



## كۆدەنگی ئەهلی سوننە دەربارەی حوكمدان بەسەر خەڵكی

٢٢ : ئەهلی سوننە دەڵێن : خەڵكی موسڵمانن لەڕووی حوكمدان و میراتگرییەوە ، نازانین ئەو كەسانە لای اللە چۆنن.

واتە : حوكمی ڕووكەش دەدەن بەپێی بینینی كردەوەی موسڵمانیەتی.

ئەهلی بیدەع : پێچەوانەی ئەمەن پێیان وایە خەڵكی ئەسڵ تێیاندا كوفرە و كافرن تاوەكو تەوحیدیان لێدەبینرێ ، نوێژو ڕۆژ و لایان نابێتە بەڵگەی موسڵمانیەتی ، بەڵام لەگەڵ ئەم مەنهەجەیان ڕاستگۆ نین چونكە خۆشیان وونن و ناوێرن و ناتوانن عەقیدەیان ئاشكرا بكەن واتە : بەمەنهەجی خۆیان خۆشیان كافر ئەبنەوە چونكە تەوحیدیان ئاشكرا نەكردووە.!

لەهەمان كاتدا مورجیئەش پێچەوانەی ئەهلی سوننەن لەسەر ئەوە بەهۆی شل ی.

★ واتە : ئەهلی سوننە نێوەندگیرن نەهەموو كەس بەموسڵمان ئەزانن وەكو موڕجیئە نە تەكفیری هەموو خەڵك ئەكەن.

٢٣ : ئەهلی سوننە دەڵێن : ئێمە موسڵمانین و ئومێدمان وایە ئیماندار بین.

# کۆدەنگی ئەهلی سوننە لەسەر حوکمی گومڕاکان

٢٤ : ئەهلی سوننە دەڵێن : موڕجیئەکان کەسانی بیدعەچی و گومڕان.

٢٥ : ئەهلی سوننە دەڵێن : قەدەرییەکان کەسانێکی بیدعەچین و گومڕان ، هەریەکێکیان نکۆڵی ئەوە بکات کە اللە هەموو شتێك دەزانێت پێش ئەوەی ڕووبدات ئەوە لەدین دەرچوە.

٢٦ : ئەهلی سوننە دەڵێن : جەهمییەکان کافرن ، واتە بەگشتی تەنانەت فەرموودەشیان لێ ڕیوایەت نەکردون.

٢٧ : ئەهلی سوننە دەڵێن : ڕافیزەکان ڕەفزی دینی ئیسلامیان کردووە ، واتە لەدین دەرچوون.

ئەهلی بیدەع و کەسانی گومڕا پێچەوانەی ئەم حوکمەن لەسەر ڕافیزەی لەدین دەرچوو.

٢٨ : ئەهلی سوننە دەڵێن : خەواریجەکان گومڕان و دوورن لە سوننەت.

دەڵێم : خەواریجی کۆن لەگەڵ ئێستا زۆر جیاوازن لەهەندێ باس تێکەوتبون دیارترینیان (دەرچون لە کاربەدەست و تەکفیرکردن بەهۆی تاوان هتد) درۆشیان

نەدەکرد ، ئەبو داود دەڵێ : ڕاستگۆترین ئەهلی بیدەع خەواریجە ، چونکە درۆ لایان تاوانی گەوربوو.

**پێچەوانەی خەواریجی ئێستا بەهۆی ئەم سیفاتانەوە:**

★ درۆ زۆر دەکەن.

★ فێڵ دەکەن.

★ دژی سوننەت و ئەهلی سوننەن.

★ تەکفیری ئەهلی سوننە دەکەن.

★ دژایەتی هەڵگران و شوێن کەوتوانی مەنهەجی سەلەف دەکەن.

★ ناگەڕێنەوە بۆ فەهمی سەلەف.

★ دین لایان دووسێ نامیلکەو ووتاری حەماسیە.

★ بانگەشەی شوێن کەوتنی قورئان و سوننەت دەکەن بەڵام بەعەقڵ و فەهمی خۆیان.

★ بە کەسانی گومڕا و لادەر دەڵێن : ئیمام و پێشەوا وەکو پەککخەرانی سیفات و تەئویل کەرانی ئەسمائو سیفات.

★ (مەبەست لە ئەهلی سوننەت شوێن کەوتوانی مەنهەجی خیرالقرون).

چینێکی تریان تەکفیری هەرچی پیشەوایە دەیکەن بەحیساب بانگەشەی قورئان و سوننەت دەکەن.

بەئیمامی ئەهلی سوننە احمد بن حنبل یان گووت : فڵان کەس بەخەراپە باسی ئەهلی حەدیس دەکاتن و دەڵێ : کەسانێکی خەراپن ؟ فەرمووی : زیندیق زیندیق زیندیق.

٢٩ : ئەهلی سوننە دەڵێن : موناقەشەو دەمەدەمێ لەدین ناکرێ و ڕێگەی پێنەدراوە ، پێویستە موسڵمان خۆی لێ بپارێزێ و دووربێ.

والحمدلله رب العالمين

## پەیامی تەبایی و یەکگرتن بۆ ئەهلی سوننە

## (سەرکەوتن لە یەك گرتنە و شکست لە دووکەرتبوونە)

سەرکەوتن لە یەك گرتنە و لەنێو چوون لە دابڕانە.

پەیامی برایەتی و تەبایی نێوان موسڵمانانی ئەهلی سوننەم پێیە لە تێکڕایی کوردستان.

بەیارمەتی الله عزوجل ماوەیەکە کاری بۆ دەکەم و کاریشمان بۆی کردوە و بەردەوامیش ئەبین.

الحمدلله ئەوەی من ئاگادارم زۆرینەی برایان و خوشکان بەبەراورد بە فیرەقی تری گومڕا زۆر زیاتر شارەزاترن بەدین و بە مەنهەجی سەلەف و خیرالقرون.

الحمدلله الله تێی گەیاندین لەدین و ئاشنای پاکترین و چاکترین مەنهەجی کردین کە نە توندە نە شلە ئەویش مەنهەجی خیرالقرون.

ئەوەی ماوە زیاتری بکەین و توندتری بکەین و کاری زیاتری بۆ بکەین برایەتی نێوانمانە.

کە دەڵێم برایەتی ، واتە خوشکانیش بۆ خوشکانیش ئەبێ وابن و خوشکایەتی نێوانیان پتەو و باشتر و چاکتر بکەن.

بمانەوێ یان نا لەهەر پەیامێکی نوێ دا گەر سەدا ٨٠ پێشوازی لێبکەن سەدا ٢٠ دژی ئەبن ، بەڵام ئامانجی گشتی لەپێش و چاکترە.

بەنووسین و بەکردەوە و بە پۆست و بە زنجیرە و بەدەرسی تایبەت لەخزمەت ئەم پەیامە گرنگە تەباییە یەکگرییە ئەبین.

تۆ کە لەسەر سوننەت و مەنهەجی خیرالقرونی پەیامەکە بۆ براکەت بەهەمان مەنهەجی خۆت ئەبینی نەك جگە لەوە.

چونکە برایەتی پەیوەستە بە بوونی بیروباوەڕێکی پاك و سەلیم و لەسەر سوننەت ، گەرنا ئەبێتە دژایەتی.

وردە وردە دەستمان پێکردوە و زیاتری ئەکەین و بەردەوام ئەبین.

ڕەحمەتی الله لەهەر یەکێکتان بێ کەوا پاڵپشت و پشتگیری و وەڵامی ئەم پەیامە گرنگە ئەداتەوە.

الله لێمان خۆشبێ و برایەتی و تەبایی و پتەوی نێوانمان زیاتر و زۆرتر بکات.

برای بچوکتان : کاروان کەمال کوردی

## ئەم پەیامە بۆ هەموو خوشك و برایەكمانە لەهەر شوێن بن

### پەیامی یەكەم :

براكەم تا ئەوكاتەی لەسەر سوننەتە ، بەهیچ جۆرێ غەیبەتی ناكەم ، بەهیچ جۆرێ ڕێگا نادەم كەس لای من غەیبەتی بكات.

بۆ خوشكانیش بەهەمان شێوە : تا ئەوكاتەی لەسەر سوننەتە بەهیچ جۆرێ غەیبەتی ناكەم ، بەهیچ جۆرێ ڕێگا نادەم كەس لای من غەیبەتی بكات.

### پەیامی دووەم :

براكەم تا ئەوكاتەی لەسەر سوننەتە ، لەهەر شوێنێك بی خۆشم ئەوێ لە پێناوی الله لەدڵەوە.

بۆ خوشكانیش بەهەمان شێوە :

تا ئەوكاتەی لەسەر سوننەتە ، لەهەر شوێنێك بی خۆشم ئەوێ لە پێناوی الله لەدڵەوە.

## پەیامی سێیەم:

براکەم تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە پاڵپشتی ئەکەم و لە پشتی ئەبم و سەری ئەخەم بەسەر دوژمنەکانیدا.

بۆ خوشکانیش بەهەمان شێوە : تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە پاڵپشتی ئەکەم و لە پشتی ئەبم و سەری ئەخەم بەسەر دوژمنەکانیدا.

## پەیامی چووارەم:

براکەم تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە قسە ووتن بەو و مەنهەجەکەی قسە ووتنە بە خودی خۆم ، هەرکەسێك لای من یان لە پۆست و شوێن قسەی بەکاکە احمد یان محمد یان فلان گوت ، واتا قسەی بەمن گوتوە و قسەی بە مەنهەجی من گوتوە بۆیە بەهەموو هێزمەوە ڕووبەرووی ئەبمەوە.

بۆ خوشکانیش بەهەمان شێوە : تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە قسەووتن پێی وە بەمەنهەجەکەی ، قسە ووتنە بە خودی خۆم ، هەرکەسێك لای من یان لە پۆست و شوێن قسەی بەکاکە احمد یان محمد یان فلان گوت ، واتا قسەی بەمن گوتوە ، قسەی بە مەنهەجی من گوتوە ، بۆیە بەهەموو هێزمەوە ڕووبەرووی ئەبمەوە.

## پەیامی پێنجەم :

براکەم تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، لەپەنهایی و تەنهایی دووعای خێری بۆ دەکەم ، و داوا لە الله دەکەم بۆی چ شتێ خێری بۆ ئەو تێدایە پێی بدا ، وەکو چۆن دووعا بۆ خۆم ئەکەم.

بۆ خوشکانیش بەهەمان شێوە : تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، لەپەنهایی و تەنهایی دووعای خێری بۆ دەکەم و داوا لە الله دەکەم بۆی چ شتێ خێری بۆ ئەو تێدایە پێی بدا ، وەکو چۆن دووعا بۆ خۆم ئەکەم.

## پەیامی شەشەم:

براکەم تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، هەر هەڵەیەك بکات پێی ئەڵێم و ئاگاداری ئەکەمەوە و هەڵەکانی بۆ ڕاست ئەکەمەوە ، بەهیچ جۆرێ ڕێگا نادەم بەبەرچاوی من بەهۆی هەڵەوە لەکەدار بکرێ ، پێش لەکەدارکردنی ئەو ئەبێ من بۆی ببمە ئاوێنە و پێی بڵێم.

بۆ خوشکانیش بەهەمان شێوە : تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، هەر هەڵەیەك بکات پێی ئەڵێم و ئاگاداری ئەکەمەوە و هەڵەکانی بۆ ڕاست ئەکەمەوە ، بەهیچ جۆرێ ڕێگا نادەم بەبەرچاوی من بەهۆی هەڵەوە لەکەدار بکرێ ، پێش لەکەدارکردنی ئەو ئەبێ من بۆی ببمە ئاوێنە و پێی بڵێم.

## پەیامی حەوتەم:

براکەم تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، بەهەموو جۆرێ هەوڵی یارمەتیدانی ئەدەم ، بەپێی توانا لە هەر شوێن بێ ، مەرج نیە تەنها ماڵ بێ ، دەکرێ دڵدانەوەت بۆی و ئامۆژگاری و بیرخستنەوەت بۆی گەورەترین یارمەتی بێت بۆی.

بۆ خوشکانیش بەهەمان شێوە : تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، بەهەموو جۆرێ هەوڵی یارمەتیدانی ئەدەم ، بەپێی توانا لە هەر شوێن بێ ، مەرج نیە تەنها ماڵ بێ ، دەکرێ دڵدانەوەت بۆی و ئامۆژگاری و بیرخستنەوەت بۆی گەورەترین یارمەتی بێت بۆی.

## پەیامی هەشتەم:

براکەم تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، هەرگیز گوێ بۆ هیچ کەس ناگرم ، باسی خەراپی یان شکانەوەی بکات ، و بیەوێ لەکەداری بکات لای من ، ئەمڕۆ گەر گوێم گرت لەوەی خەڵك بەخەراپە باسی بکات ، بەیانی خەڵک گوێ ئەگرن لەهەمان کەس تا بەخەراپە باسی من بکات.

بۆ خوشکانیش بەهەمان شێوە : تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، هەرگیز گوێ بۆ هیچ کەس ناگرم باسی خەراپی یان شکانەوەی بکات ، و بیەوێ لەکەداری بکات لای من ، ئەمڕۆ گەر گوێم گرت لەوەی خەڵک بەخەراپە باسی بکات ، بەیانی خەڵک گوێ ئەگرن لەهەمان کەس تا بەخەراپە باسی من بکات.

## پەیامی نۆیەم:

براکەم تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، موناقەشە و دەمەدەمێی لەگەڵ ناکەم ، لەباسێکی فیقهی لاوەکی اختلافی ، مادام باسێکی مەنهەجی و ئەسڵ نەبێ ، چونکە دەمەتەقێ و مشتومڕ ، دڵ ڕەق دەکات و تۆی دووبەرەکی دەچێنێ و ڕق زیاد دەکات.

بۆ خوشکانیش بەهەمان شێوە : تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، موناقەشە و دەمەدەمێی لەگەڵ ناکەم ، لەباسێکی فیقهی لاوەکی اختلافی ، مادام باسێکی مەنهەجی و ئەسڵ نەبێ ، چونکە دەمەتەقێ و مشتومڕ دڵ ڕەق دەکات و تۆی دووبەرەکی دەچێنێ و ڕق زیاد دەکات.

## پەیامی دەیەم:

براکەم تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، دڵم بەرامبەری زۆر گەورە بێ و لێبوردە بم بۆی ، هەرگیز ڕق و قینەم بۆی لەدڵم هەڵنەگرم ، و دواتر شەیتان زاڵ بێ بەسەرمان ، ئینجا تۆی دووبەرەکی بچێنێ لەنێوانمان و لێکبترازێین ، و هەوڵی لەنێو بردنی یەك بدەین.

بۆ خوشکانیش بەهەمان شێوە : تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، دڵم بەرامبەری زۆر گەورە بێ و لێبوردە بم بۆی ، هەرگیز ڕق و قینەم بۆی لەدڵم هەڵنەگرم ، دواتر

شەیتان زاڵ بێ بەسەرمان ، تۆی دووبەرەکی بچێنێ لەنێوانمان و لێکبترازێین و هەوڵی لەنێو بردنی یەك بدەین.

## پەیامی یازدەیەم:

براکەم تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، هەرشتێك بڵێن لەسەری بڕواناکەم تاوەکو دڵنیادەبمەوە لەخودی خۆی ، بەرگری لێبکەم گەر بەخەراپە باسیان کرد ، فەرموودەیە دەبێ براکەت سەربێخی گەر ستەمی لێکرا.

بۆ خوشکانیش بەهەمان شێوە : تا ئەوکاتەی لەسەر سوننەتە ، هەرشتێک بڵێن لەسەری بڕواناکەم تاوەکو دڵنیادەبمەوە لەخودی خۆی ، بەرگری لێبکەم گەر بەخەراپە باسیان کرد ، فەرموودەیە دەبێ براکەت سەربێخی گەر ستەمی لێکرا.



# پەیامی کۆتایی

تۆ کە لەسەر سوننەت و مەنهەجی خیرالقرونی ، واجبە لەسەرم بەپێی شەرع و دین و فەرمودە و ئەسەری سەلەف ، کەوا بەو شێوەبم لەگەڵت:

★ دڵم خۆشبێ بە بوونت.

★ دڵم تەنگ بێ بە نەبوونت.

★ دڵخۆش بم بە سەرکەوتن و بەرزبوونەوەت.

★ دڵتەنگ بم بە شکست و نزمبوونەوەت.

★ دەستت بگرم لەکاتی پێویستی و نەهامەتی.

★ درۆت لەگەڵ نەکەم و فریوت نەدەم.

★ تەنها لەپێناو ئەوەی لەسەر سوننەتی لەگەڵتم.

★ چ شتێکم بۆ خۆم پێ خۆشە بۆتۆش دەبێ وابم.

★ چ شتێکم بۆخۆم پێ ناخۆشە بۆتۆش دەبێ وابم.

★ ئەم پەیامی تەبابیە بۆ کەسێکە هەمان مەنهەج و باوەڕی تۆی هەبێ و وەکو تۆ لەسەر مەنهەجی خیرالقرون بێت ، بەتایبەت بۆ ئەم کاتەی ئێستا زۆر پێویستە

، کە سوننەت لەوپەڕی نامۆیی و غوربەتدایە و هەڵگرانی لەنێو خەڵکیدا زۆر نامۆ بوون و بێزراون ، بۆیە تەبایی و پتەوی نێوانمان هێز بەئەژنۆمان دەبەخشێ و لەکەوتن ڕزگارمان ئەکات و ڕێگاش نادا شەیاتینی ئینس و جین فێڵمان لێ بکەن.

